# پەند وەرگرە لە ٥٠ بەسەرهاتی قوربانیانی شەیتان

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

محمد حەسەن سەرگەینێڵی




چاپی دووەم
هەولێر ٢٠١٣





ناسنامەی

**ناوی کتێب: پەند وەرگرە لە (٥٠) بەسەرهاتی قوربانیانی خۆشەویستی**

**بابەت : ئایینی**

**ئامادەکار : محمد حەسەن سەرگەینێلی**

**کۆمپیوتەر : نوسینگەی هیوا**

**چاپی : دووەم/ ٢٠١٣**








**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٥٣٢ )ی سالی ( ٢٠٠٩)ی پێدراوە.**

07504671394
hawler.chap@gmail.com

# پەند وەرگرە لە (٥٠) بەسەرهاتی قوربانیانی شەیتان

ئامادەکار: محمد حەسەن سەرگەینێڵی

چاپی دووەم

٢٠١٣

هەولێر

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لاَّ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ (يس:٦٠).

ئەمەی لەم کتێبەدا دەیخوێنینەوە کۆمەڵە ڕوداوێکی راستەقینەی کۆمەڵایەتی کۆن و تازەن سەبارەت بە کۆمەڵە کەسانێك کە دەبنە قوربانی داوی شەیتان و وەسوەسەکانی ئەو لەخشتەیان دەبات، لەئاکامدا توشی ئازارو ئەشکەنجە و دەردو بەلا دەبن. ئەمەش لە کاتێکدا ڕودەدات، کە ئەو پەیمانەی لەسروشتدا لەگەڵ خودا بەستویانە، لە یادی دەکەن و دەیشکێنن، کە دوژمنی سەرەکی ئەوان لەدنیا شەیتانە و بە دوژمنی بزانن و، خۆیان لە وەسوەسەو ----- بە دەکانی بپارێزن، ئەگەرنا گومڕایان دەکات، لەخشتەتان دەبات. ئەمەش دەبێتە هۆی سزای خوایی و ئازاری دادگەری ئاسمانی، کە لە دیناو پەسلاندا گرفتاری دەبن. بەو هیوایەین، ئەوانەی بونەتە قوربانی شەیتان، بۆ خواپەرستی و ڕەوشتە جوانەکان بگەڕێنەوە ، کە کەسایەتییەکی بەرزو سەرکەتو بە مرۆڤ دەبەخشن ، ئەوانەش کە

تووشی نەهاتون، زیاتر سەنگەر لەشەیتان بگرن و بەبڕواو تەقواو کارە جوانەکان و ڕەوشتە بەرزەکانو خۆیان پڕ چەکتر بکەن پەند لەو چیرۆکانە وەربگرن، چونکە هەرچی بکەوێتە داوی شەیتان زوویان درەنگ مسۆگەر زەرەر دەکات،!

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ ﴾(یونس:١١١).

**(محمد حسن) چیوەی سەری ٢٨/٨/٢٠٠٨ز.**

## چیرۆکی یەکەم

# قـابيــــل[1]

یەکەم قوربانی دەستی شەیتان لەزەویدا قابیل، ئەمەش لـە کـاتێ دابوو، کە وەسوەسەی بۆ کرد هابیلی براکەی بکوژێت، خوا دەفەرمێ:

---

([1]) بەپێی کیتابی موقددەس )التکوین/٢/١٠-١٥) بەهەشتی ئادەم (الجنة) یان ئەم باغچەیە لەنێوان رووباری فیشونو جیحون و حیددا قل و فوراتدا بووە .( هـ ا. رایت) لەکتێبی(اثار العصر الجلیدي البلا ستویني) دا ئاماژە دەکات چەرخی بلا ستۆسینی کە ژیانی تێدا دروست بووە ناوچەی هەلگوردو جودیو روباری رواندزو جیلوداغ بووە. لای (ابن عباس) و (ابن یحیی) وەکو لە (قصص الانبیاء/ ابن کثیر) داهاتووە ئەم (الجنة)ی ئادەم باخچەیەك بووە لەزەویدا بەپێی تابلۆ دێرینەکانی نوح —س—کەلەسالی (١٩٢٠) ئینگلیزلەکوردستاندا دۆزینەوە، گۆڤاری هایدپاركو رۆژنامەی عەرەب (٢٨-٢٩-١٩٩٠/٥/٣٠) بلاوی کردەوە لەسەر لێکۆلینەوەکانی شوێنەوارزان (هی عابد) شوێنی ئادەم (دار السلام) بووە لەرواندز و گۆڕی هابیل لایقەسرێیە ویەبابە گەورەناسراوەو خەلکی سەردانی دەکەنو نازانن کێیە! شایانی باسە ئەمتابلۆیە دێرینە جوانایە بەزمانی کوردی سۆرانی نووسراونەوە، کەکورد لێیانبێ ئاگایە دیسان (القرطبي) (ابن عباس) دەلێ (کاتێ لەم باخچەیە دابەزی بۆ زەوی پێی فەرموو بچۆ کەعبە بۆمن بنیات بنێو تەواف بکە) (تفسیر القرطبي /ج٢/ ل: ١٢٠/ ٧٠٠). بەم پێیە لە ناوچەی دۆزێوە چووەتە حیجاز کەعبەی بنیات ناوو ژیانی تێدا داناوە وەکو (القرطبي) لە (٧٠٠) داباسی کردووە لە(عگاو) ەوە : کەعبەی لەتاوێرو بەردی چیای چراو سیناولوبنانوجودی دروست کردووە (جارەکی تریش ئیبراهیم کاتێ لە(فدان ئارام) یان دۆلێ ناران لای بیتوێن کۆچ دەکات کەعبەبنیات دەنێتەوە (عبدالوهاب النجار) لە (قصص الانبیاء ) دا دەلێ (ئیبراهیم)وەکو لەتەوراتدا هاتووە لە (فدان ارام) لە دایك بووە لەعیراقدا بەوپێیەشا تۆی قابیل و هابیل لەکوردستاندا رویداوە وەداستانیش نوحیس هەر لەکوردستاندا بووە: (واستون علی الجودي) ئامادەکار

﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾. ﴿المائدة﴾٢٧.

واتە: هەواڵی کوڕانی ئادەمیان بەڕاستەقینە بۆ بخوێنەوە، کاتێك هەر دووکیان قوربانیان کرد، ئینجا لە یەکێکیان وەرگیراو لە ئەوەی تریان وەرنەگیرا، ئەویش وتی: من بێ دوودڵی دەتکوژم وتی: خودا تەنیا لە تەقواکارانی گیرا دەکات.

قورتوبی دەڵێ: شەیتان یەکەم کەس بوو یاسای بێ باوەڕی دانا، قابیل یەکەم کەس بوو ڕێ و شوێنی کوشتنی داناو، هۆکاری هەموو ئەوانەش ئێرەیی بوو.

(ابن کثیر) لە (تفسیر)ە کەیدا دەڵێ: (خوداوەند لەبەر ناچاری ڕێگای بە ئادەم دابوو، کچەکانی لە کوڕەکانی مارە ببڕێت، بەڵام گوتراوە حەوا لەهەر سکەو جمکێکی دەبوو، هەر جارەو کوڕێك و کچێکی دەبوون، مێیەی ئەم سکەی لەکوڕی سکەکەی ترمارە دەبڕی (دەبەخشی).

خوشکی هابیل دزێوو ناشیرین بوو، هەرچی خوشکی قابیل بعوو زۆر شۆخ و شەنگ دەبێ، ئەو ویستی ئەو خوشکەی بۆ خۆی بێت، بەڵام ئادەم ڕێگای نەدا تا قوربانی نەکەن، ئەوە بوو قوربانی هابیل

وەرگیراو هی قابیل پەسەند نەکرا، ئەمەیە خوای گـەورە بـە داسـتان بۆمانی گێڕاوەتەوە.

(ابن عباس) و (ابن مسعود) دەڵێن: ( هەر دووکیان قوربـانی یـان کرد، ئاخۆ کامیان شایانی ئەم کچە جوانەن، هابیل کاوڕێکی قەڵەوی کردە قوربانی، هەرچی قابیل بوو گوزرە گوڵە گەنمەکی کردە قوربانی، لەکاتێکدا گوڵە گـەنمێکی قەڵـەوی تێـدا دەبینـیێ، پـڕی دەداتـیێ و دەیخوات. بۆیە کاتێ ئاگرێك لە غەیبەوە هات قوربانی و بەشە خێـری هابیلی خواردو بەشە خێری قابیل لێ گەڕا، بۆیە توڕە بوو وتی: ( من دەتکوژم، تا خوشکی مـن مـارە نـەبڕیت، هابیـل وتـی: ( خـوا لـە تەقواکارانی وەردەگرێت).

(ابن بەریر) گێڕاویەتیەوە. پاشان خوای گەورە لەگێڕانەوە بەردەوام دەبێت ﴿لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِـي مَـا أَنَـاْ بِبَاسِـطٍ يَـدِيَ إِلَيْـكَ لَأَقْتُلَـكَ إِنِّـي أَخَـافُ اللّـهَ رَبَّ الْعَـالَمِينَ﴾. ﴿المائـدة/٢٨﴾. لێـرەدا برایەکەی ئەو، کـە پیـاو چـاکێکە خـوا قوربـانی ئـەوی وەرگرتـووە، چونکە تەقواکار بوو، دوای ئەوەی برایەکەی هەڕەشـەی کوشـتنی لێ دەکات، بێ ئەوەی تاوانێکی کردبێ پێی و دەڵێ: (گەر تۆ دەستم بـۆ درێژ بکەی تا بتکوژم ، من دەستت بۆ درێژ ناکەم). واتە: لەبەرامبەر خراپەی تۆدا منیش خراپە ناکەم، گەرنا جیاوازی لە نێوان من و تـۆدا

چییە. ﴿إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾.( واتە لە خوای پەروەردگاری جیهانیان دەترسم). واتە تۆ چی دەکەی بیکەی، من لەبەرامبەر ئەوەدا ئارام دەگرم.

﴿إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاء الظَّالِمِينَ﴾. ﴿المائدة/٢٩﴾. واتە: من دەمەوێ تاوانی من و هی تۆش بکەوێتە ملت (ئەستۆت)، بەمە ببیە کەسێك لەیارانی دۆزەخ بی، ئەوەیە سزای ستەمکاران. (ابن عباس و مجاهد) دەڵێن: واتە: بەهۆی تاوانی کوشتنی من و تاوانی پێشوت. (ابن عباس) دەڵێ: لێرەدا بە ئاگری دۆزەخی دەترسێنێ، بەڵام دەست هەڵناگرێت.

﴿فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾. ﴿المائدة/٣٠﴾. واتە: دەرونی ئەم کارەی لەبەر چاو شیرین کردو کوشتی، بەم کارە بوو بەکەسێ لەوانەی زیانیان لێ دەکەوێت. ئینجا بەئاسنێك کەبەدەستییەوە بوو، کوشتی. (سەددی) وتویەتی: قابیل سۆراخی کرد بۆ کوشتنی، کاتێ هابیل بەنیازی بوو، بڕواتە سەر لوتکەی چیایەکان مەڕەکان بلەوەڕێنێ ، ڕۆژێکیان خۆی گەیاندە ئەوێ، بینی خەوتووە، لەو کاتەدا تاوێرێکی بەرز کردووە و سەری قەڵاشتەوە و گورج کوشتی. ئەنجا لە دەشتایی بەجێ ی هێشت (ابن

جریر) گێڕاویەوە.

﴿فَبَعَثَ اللّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ ﴾. ﴿المائدة/٣١﴾. (سەددی) دەڵێ: کاتێ هابیل مرد، لە دەشتایی بەجێی هێشت، سەراسیمە بوو، نەیزانی چی لەبراکەی بکات و چۆن بیشارێتەوە، بۆیە خودا دوو قەڵەڕەشی ناردن، کە برای یەکتری بوون، کەوتنە شەڕ لەگەڵ یەکتریدا یەکێکیان ئەوی تری کوشت، ئیجا چوو زەوی بۆ هەڵکەندو قەڵە مردووەکەی تێدا ناشت، کاتێ بینی وتی: (هاوار بە خۆم من چۆن لەو قەڵەڕەشەیە بێ دەسەڵات ترم، کەتەرمی براکەم بنێژم)؟ ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ﴾. پەشیمان بۆوە، بەڵام بۆ لە دەستدانی، نەك لەبەر تاوانی کوشتنی. بەم شێوەیە بوو بەکەسێ لە قوربانیانی شەیتان.

**چیرۆکی دووەم:**

# فیرعـــەون

ئەو دکتاتۆرە خۆبەزلزانە، کە ملی بۆ شەیتان کەچ کردوو، هەرچی پیێ ی وت بەقسەکانی کرد، ئەوە بوو بڕوای بە خـوا نـەکردو سـتەم و زۆرداری لـە زەوی داکـرد وتـی: ﴿أَنَـا رَبُّكُـمُ الْـأَعْلَى﴾. واتـە: مـن پەروەردگاری بالاّ دەستی ئێوەم. وتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾. ﴿القصص/٣٨﴾. واتە: ئەی خەڵکینە جگە لەخۆم بە بەخوای ترم نەزانیوە. ئەوە بوو جینۆسایدی گـەلی ئیـسڕائیلی کـرد و کوڕانی دەکوشتن و کچەکانی دەهێشتنەوە بۆ خراپەکاری و کـەنیزەیی و دوبەرەکی خستبۆ ناویانەوە، ئەو خاوەن مێخ و ئـەهرام بـوو، بـەڵێ فیرعەون یاخی بوو وسـتەمی کـرد، ئـەنجا خوداوەنـد موسـاو هـاڕون پێغەمبەری - دخ — ڕەوانە کردنەلا، کە بەنەرمی لەگەڵیدا شایەد بیر بکاتەوە، یان بترسێ: ﴿اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾. ﴿طه/٤٣-٤٤﴾.

بەڵام فیرعـەون پتر لەسەر فیزو خۆبەزلزانی خۆی و زۆرداریەکەی پیێ داگرتوو بوو، بۆیە خودا لەدیناو پەسلاّندا سزای بۆ بڕیەوە:



﴿هَلْ أتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَى أَن تَزَكَّى وَأَهْدِيَكَ إِلَى رَبِّكَ فَتَخْشَى فَأَرَاهُ الْآيَةَ الْكُبْرَى فَكَذَّبَ وَعَصَى ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَى فَحَشَرَ فَنَادَى فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَى ﴾. ﴿النازعات﴾. واتە: ئایا هەواڵی موسات پێ گەیشتووە. کاتێ پەروەردگاری بانگی کرد لە دۆڵی پیرۆزی توڕادا. (پێ ی فەرموو:) بڕۆلای فیرعەون ئەو یاخی بووە. پێ ی بڵێ ئایا دەتەوێ پاکژببیەوە. ڕێنماییت بکەم بۆ لای پەروەردگارت و بترسێت. ئینجا بەڵگەی گەورەی پیشاندان.

ئەویش بەدرۆی خستنەوەو سەرپێچی کرد. پاشان پشتی هەڵکردو هەوڵ دەدات. ئەنجا خەڵکی کۆکردەوە و جاڕی دا.

وتی: من پەروەردگاری هەرە باڵاتانم. دوایی خوا لەپەسلاَن و جیهاندا سزای دا. لەوەشدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێ بترسێت.

کاتێ موسا پەیامی خۆی بە فیرعەون ڕاگەیاند، نەك هەر باوەڕی نەهێنا، بەڵکو هەڕەشەشی لێ کرد، بۆیە خودا فەرمانی دایە موسا نەوەی ئیسرائیل لەگەڵ خۆیدا ببات و بە ئاراستەی دەریادا بڕۆن، کاتێ خەڵکە کە کەوتەڕێ فیرعەون بەمەی زانی، بۆیە بۆ ڕاوەدونانیان

و دەست گیرکردنیان، سوپای خۆی کۆکردەوە. کاتێ فیرعەون گەیشتە ئەو شوێنەی موساو نەوەی ئیسرائیلیەکانی پێدا پەڕینەوە، ڕێگایەکی لە دەریاکە دا کەوتە بەرچاو، کە هەموارە، بۆیە چاوی تێ بڕی، کە خۆی و لەشکرەکەی پێدارەت بن. ئینجا دەستوری دایە لەشکرەکەی پێیدا بپەڕێتەوە. لەکاتێ دا فیرعەون و لەشکرەکەی گەیشتنە ناوەڕاستی ڕێگا، تەواوی نەوەی ئیسرائیلەکان گەیشتنە کەناری دووەم، پاشان فەرمانی خوا هات، کە گەڕانەوەی نییە، لەزەوی‌و ئاسماندا ئاوی دەریاکە گەمارۆی فیرعەون‌و لەشکرەکەیدا، ئینجا بەسەریاندا کەوت ، هەر هەموویان نقوم بوون و هیچیان دەربازییان نەبوو، ساتێ نقوم بونەکە زۆر بۆ فیرعەون تاڵ بوو، ئەنجا هاواری کرد:

﴿آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلِـهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾. ﴿يونس/٩٠﴾. واتە: باوەڕم هێنا بەو خودایە، کە نەوەی ئیسرائیل باوەڕی پێ هێناوەو، من یەکێکم لە موسڵمانان[٢].

بەڵام خودا تۆبەی وەرنەگرت، چونکە ئەو کاتە گیانی گەیشتبووە گەرو، لەشی کەوتەسەر کەنار دەریا، ئەنجا خوای گەورەی فەرمووی:

---

(٢)چونکە کاتێ تۆبەی کرد کە گیانی گەیشتبۆ گەرو، دیارە بەپێی فەرموودەی (صحیح) ئەو کاتەتۆبە گیرانابێت.

﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾. ﴿يونس/٩٢﴾. واتە: ئیمڕۆ لاشەکەت ڕزگار دەکەین، تاببیە موعجیزەیەك بۆ کەسانێ دوای خۆت، وە زۆر کەس لەموعجیزەکانی ئێمە بێ ئاگان.

بەڵێ لەسەدەی بیستەمدا تەرمی فیرعەون لەیەکێ لەهەرەمەکانی میسرِدا دۆزرایەوە، بێ ئەوەی تێك چوبێ یان گۆڕانێکی بەسەردا هاتبێ، ئەمەش ئەو ڕاستیە بوو، قورئان پێشبینی کردبوو جیهان بەچاوی خۆی بینی!

**چیرۆکی سێهەم:**

# ڕاسپاردەی منار

منار کچێکە دوچاری ئایدز بووە، ڕاسپاردەی خۆی بۆ هەموو کچە موسڵمانەکی دەنوسیێ، کە لەسەر ڕێگای ئەون، شایەد بەم چەند وشانە ڕزگاریان بکات، بۆیە هەروەك خۆی بۆتان دەگوازمەوە، بەڵکو بەم وشانە نامەی کچێکی گەڕاوە بە هەموو ئەو کچانە بگەیێنم، کەساختەیی خۆشەویستی و ئارەزوەکان و وەسوەسەی شەیتان سەرنجی ڕاکێشاون.

بۆ گۆڤاری (شهر الفتيات). بۆ ستافی ئەم گۆڤارە جوانە...

پێت وابێ لە کوێوە دەست پێ بکەم و چۆن دوایی بەقسەکانم بێنم.

لەچەند ساتێکی تاڵدا دەژیم... لەوێ دا خۆشی و ناخۆشیم لەناخمدا دەستە ملانی یەکتری دەبن. لە دژوارترین قۆناغەکانی ژیانم دا دەژیم، گەر نامەی منتان خوێندەوە ئەو کات کلۆڵیەکانی من تێ دەگەن.

دەمامك لەسەر قەڵەمم لاداوە و هێزی خۆم گرد کردۆتەوە، تاوەکو تراژیدیاو ئاهـ و فرمێسکەکانم بنوسم.



دوای ئــەوەی بابــەتێکم لــەگۆڤاری ئێــوە (ژ:٥)دا خوێنــدەوە بــە ناوونیشانی (لەعەرەبەستانی سعودیو هۆو ڕاستییەکانی).

بابەتەکە زۆر خامۆشی کردم، هەتا کاتێك ئەو ناوونیشانەم لەســەر بەرگی گۆڤارەکەدا خوێندەوە وام دەزانی مەبەستتان لــە منــە. بــەڵێ دەزانم، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم چوار دانەم لەو گۆڤارە هەڵگرت و کڕینم، ڕەنگە بۆ ئەوەم بووبێ تابزانم ناوی منیشی تێدایــە!... پێتــان سەیر نەبێ... بەڵێ من توشی ئایــدز بــووم، لــەکاتێ دا ئــەم قــسەیە دەکەم، کە لەدواســاتەکانی تەمــەن دام ، نــەدەخۆم و نەدەخۆمــەوە و تەنیا هەست بەچێژی نزیك بونەوە لەخوا دەکەم. تــەنیا لــەکاتی نوێــژ کردندا هۆشم لەسەر خۆمەو، داوا لەخوا دەکەم بمخاتــە بەهەشــتەوە، تا لەوێدا ژیانی داهاتوو بدۆزمەوەو ئەو کامەرانیە بەدەست بێنم، کە بەدوای دا دەگەڕێم. بەڵێ من توشی ئایدز بووم. شایەد ئەمە بۆ مــن تاقی کردنەوەی خوا بێ تا بــۆ سەرشــەقامی ڕاســتەڕێ بگەرێمــەوە ، بەلاّم پێتان ناڵێم چۆن توشی هــاتووم، چــونکە ئــەی گــەنجی ئــافرەتی موسوڵمان شەرم دەکەم. بەرەولای پــەروەردگارتان بگەڕێنــەوە، چــاك بزانن هیچ شتێ نامێنێ و، پێویستە کچانی لاو لەچــێژە حەرامــەکان خۆیان دوربخەنەوەو، نەکەن گوێڕایەڵی خودا نەکەن.

بەڵێ داواتان لێ دەکەم، ئاورێك لەئاین و خزم و کەستان بدەنــەوە،

هەرکەس لەبەر خوا واز لەشتێك بێنێ، خوا بە چاکە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە، ئەی گەنجانی ئیسلام.

وریابن... ئاین و دەست پێوەگرتنی تاکە ڕێگای ڕاستەقینەیە بۆ ڕزگاری ئێوە.

نزام بۆ بکەن. داوای بەزەیی و لێ خۆش بوونم بۆ بکەن.

خوشکی ئامۆژگارتان منار.

**چیرۆکی چوارەم:**

# کچەکەت دوگیانە

ئەمە قوربانیەکی تری ئەم خۆشەویستییەیە، ئەمە ژنە گەنجێکە لە هەرەتی لاوی دایە ، مێردی بەئامۆزای خۆی کردووە، بەڵام ئەو کورە زۆردار و خۆپەرست و دڵرەق وبێ ویژدان بوو، دوای هەموو ئەوانەش مەی خۆر بووە، کاتێ داوای تەڵاقی لێ دەکات، دەست بەلێدانی دەکات. ئەوەی گرنگە تەڵاق درا. دوای حەوت مانگ جیابونەوە، لەکاتێك دا دوگیان بووە، دوای ماوەیەك لە جیابوونەوە، سەر سەختەو کلۆڵی خێزانیەکەی، کە مامەڵەی رەقی لەگەڵدا دەکرد بەختەوەر یەکەی زیاتر لێ تێك چوو، لەبۆیە ئەوە پەیوەندی بەهاورێیەکیەوە کرد، تاهەندێ دڵخۆشی بداتەوەو کەمێ لەخەمەکانی برەوێنێتەوە، بەڵام یەکەم جار نەهات پەیوەندی خۆی بە خوداوە بکات.

لەکاتی پەیوەندی کردندا بێ ئەوەی ئاگای لێ بێت پەیوەندی بەژمارەیەکی هەڵە دەکات، لەو کاتەدا گەنجێك وەڵامی دەداتەوە، ئەویش پرسیاری هاورێ یە کچەکەی لێ دەکات، رەنگە هەستی بە



ئـــاهوزاری نـــاخی کردبـــێ، ئـــەویش بـــە ژنـــە گەنجەکـــە دەڵـــێ: پەیوەندییەکەت هەڵەیە.

لەکاتی گەڕانی بەشوێن ژمارەی دەستە خوشـکەکەی، ئـەو گەنجـە نابوتە ئەوە بە هەڵ دەزانێ تا پەیوەندی پێوەبکاتـەوە، بۆیـە لەگـەڵی دەست بەقسەی شیرین دەکات، ئەمە ڕێککەوت بوو، بەڵام لە هـەزار ژوان و دیدار باشتربوو، دڵەکان یەکتریان بینیەوە دیـداری یـەکترییان کـــــردووە...... ڕۆژی دووەم پەیوەنـــــدی پێـــــوەکردەوە، ئینجـــــا پەیوەندییـــەکانی لەگـــەڵ دا زیـــاتر کـــردو دەســـتی بـــە گێڕانـــەوەی بەسەرهاتی درۆکرد، سەبارەت بەهەندێ لەو ناخۆشیانەی لە ژیـانی دا بەسـەری داهـاتون، بەتایبـەتی ئـەو ئێـستا ژنـی خـۆی تەلاقـداوە، لەژنێکی تر دەگەڕێ، کە بەختەوەری بکات.

ئـای لـەو کارەسـاتە گەورەیـە.. کارەسـاتی ئـەویش هاوشـێوەی کارەساتی ئەوە، بەڵکوکت و مت وەکویەکن.. کچەکە دڵی بۆی نـەرم بوو، قسەکانی خۆش بوون لەگەڵی دا، لەگـەڵ بـەردەوامی پەیوەنـدی پێوە کردنەکەدا، زیاتر تراژیدیاکانی خـۆی بـۆ دەگێڕایـەوە، گریـان و ئازاری خۆی تێدا پیشان دەدان.

ڕۆژان دەڕۆن و ئاخاوتن بەردەوام دەبێت، ئـەوو شـانە، کەلەسـەر پەخـشی خـەم و ئـاهو ناڵـە دامـەزرا بـوون، بـۆ چـەند وشـەیەکی

خۆشەویستی و ئەوین و عشق و شەیدایی گۆڕان. بەڕووی داهێنا، کە دەیەوێ بیکاتە هاوسەری ژیانی خۆی، چونکە ئەو ئەو کچەیە لەمێژە بەدوای دا دەگەڕێت، داوای دەکات چاوی پێ بکەوێ، ئەمەشییان بۆ چووەسەر، تا ئەم پەیوەندییە وای لێ هات، ئەو ژنە هەندێ لە زێڕەکانی خۆشی بۆ قەرزدانەوە بەکوڕەکە ببەخشێت.

ئەو ژنە هەر داواکارییەکی دەهات لەبەر ئەو کوڕە شەیتانە ڕەتی دەکردەوە، بەو هیوایەی ئەوبێ داخوازی بکات، هەتا ئەو کوڕەی پەیدای دەبێ بەناوی ئەوەوە،کە (عەشیق)ە ناودەنێت. دوای ماوەیەك پێ لەسەر ئەوەدا، دەگرێ، دوای پەیوەندی پێوەکردنی، کە دێ بۆ خوازبێنی کردنی، دوای ئەوەی، کە ئەو مارەیی دابین کردووە، ئەنجا داوای لێ دەکات بیبینێ تاپێکەوە سەردانی بازاڕ بکەن و جلی بوکێنی و ئەموستیلەی بۆ بکڕێ، ئەویش گورج ڕازی دەبێت.

هەردوکیان چونە بازاڕو جلەکەی بوکێنی نیشان داو، پاشان چونە شوقەی نیشتەجێ بوون، کە چونە شوقەکە داوای لێ کرد جلەکە تاقی بکاتەوە. دیارە لەژێر فشاری پێکەوە بونێکی حەڕام و تەماشا کردنەکی ناڕەوای شەیتانی دا، بە مەبەستی بێ ئابڕووی، کە شەیتان سێیەم کەسیان دەبێ، دەبێ چی لەوانە چاوەڕوان بکرێ، ڕوبدات؟ لەکاتی بڕواداڕناوە وسەرپێچی خودا کراوە...بێگومان داوێن پیسی

لەگەڵ ئەم ئافرەتە داوێن پاکەو ئەو ئافرەتە بێ ئاگایەدا کردو، داوێن پاکی و شەرەفی لێ سەندو بە ئاگری سزا سوتا... لەکاتی وا خەوی بێ ئاگایی بێدار بۆوە هاواری کردو قیژاندی و گریا، بەڵام سودی نییە...

ئەینجا لەگەڵ دەستی کردەوە بەپەیوەندی کردن، بەڵام ئەو هەمیشە خۆی لێ دوردەگرت، تا جارێکیان بە قسەیەکی توندو تورە وەڵامی دایەوەو ویی ی وت: ئافرەت بەڕاستی گوێ لەمن بگرە، من ئافرەتەکی وەکو تۆم قەت ناوێ، چونکە هەرگیز بڕوات پێ ناکەم، تکایە ئەمە ئاخر پەیوەندیت بێ، پاشان تەلەفۆنەکەی داخست.

گەر گوێ ی لەم قسانە بوو بەلادا هاتوکەوت، بەڕاستی دەمامکەکە کەوت و پەردەکە هەڵدرایەوە... ئەی کوان وشەکانی شیرینی خۆشەویستی؟ کوا گریانی کوڕەکە بۆ ئەو؟ کوا سۆزەکەی، کە لەکاتی قسە لەگەڵ کردنی پیشانی دەدا؟ کوا کراسی بوکێنی، کە بەڵێنی دابوو بۆی بکڕێت. مانگ و نیوێ لەسەر جێگا کەوت، چونکە هەڵوێستەکە بۆ ئەو شڵەژان و خورپەیەکی گەورە بوو، وای لێ هات ڕقی لە ژیان و خودی مەلۆتکەکەشی بێتەوە، چونکە ئەو ستەمکارەی یاد دەخستەوە، کاتێ چاك بۆوە وهەستی بە پشودان کرد، ڕۆژەکی تریش بەلادا هاتوو بورایەوە کەفی هەڵدا. ئینجا باوکی

بــۆ نەخۆشــخانەی بــرد، دوای پــشكنینی پزیــشكی نوژدارەكــە بــە باوكەكەی وت: مژدەبێ كچەكەت دوگیانە، ئەم قسەیە بۆ ئــەو وەكــو هاتنی تریشقەیێ بوو بەسەری دا.

كاتێ دنیا لەبەر چاوی بــاوكی دا تاریــك داهــات بــیر كردنــەوەی شپرزە بوو، حەپەسان زمانی گرت، نەیزانی چی دەڵێ و چۆن هــەڵس و كەوت دەكات... چۆن كچەی من دوگیان بووە و مێردیــشی نییــە، بەڵام دانی بەخۆیدا گــرت و داوای لــە نوژدارەكــە كــرد ئــەم هەواڵــە بەكچەكە نەدات. هەركــە باوكەكــە گەیــشتەوە ماڵــەوە، كــە ئــاگری لەدڵدا هەڵگرتبو بردییە ژورەكی بە تەنیایی و ئەو هەواڵەی ڕاســپارد، كە دڵەكەی نــەیتوانی چــەند خولــەكێ بەرگــەی بگرێــت، كــچە بــەو هەواڵەی باوكی كەوت و پەڕەكانی لەسەری دا تێكەڵ و پێكەڵ بوون و لەزمان كەوت و خوێن خزایە ســەرو دەســتی شــین و گریانــەكی تــاڵی كرد، لەكاتێ دا لەحەپەسانو تاسان بێدار بۆوە، كــە بــاوكی لیّ ی داو بەسەری دا قیژاندی بێ ئابڕوو چۆن دوگیــان بــووی؟ بــێ شــەڕەف چۆن دوگیان بوویت؟ بەسەرهاتی ئەوەم بەتــەواوی بــۆ بگێــڕەوە چــۆن سكت پڕ بووە؟

كچەكەش لەسەردتاوە ڕوداوەكەو پەیوەندی خۆی لەگەڵ پیاوەكە بۆ گێڕایەوەو بۆی لەبنی كولەكەدا، بــەڵام بــاوك لــەكاتی بیــستنی ئــەو

قسەو ڕوداوونەی کچەکەی، کە نـاموس و ئـابڕوی خـۆی بـە شـەیتان فرۆشتووە خۆی بۆ ناگیرێ و، دەکەوێتە لێدانی بە مشتەکۆڵە و شەق، هەرچی کچەکەیە هاوار دەکات و دەگرییێ و تکـای لێ دەکـات لێ ی ببورێ، ئەوە بوو لەدەستی باوك هاتەدەرو بەزەو دەرگا ڕای کـرد، تـا لەدەسـتی ڕابکـات، بـاوك بەمەشـێت تـر بـوو، تـاوی دایـە پارچـە ئاسەوارێکی ئاسن، کە لەتەکیەوە بـوو گرتیـە کـچەکەی و بەپـشتی سەری دادا گورج کەواندی بە زەویـداو بوراندیـەوە. جۆگەلـەی خـوێن لەسەری هەڵبەسترا، هەر لەو کاتەشـدا برایەکـەی گەیـشتە سـەریان، بینی خوشکی بەزەوی داکەوتووەو خوێن لەسەری جۆگەلەی بەستووە، ئەویش بە خێرایی گەیاندییە نەخۆشخانە، سەرەتا چەند پـشکنینەکی پزیشکی سەرەتایی بۆکرا، پاشان پیشانی پزیشکەکی ئافرەتی پـسپۆڕ درا، لـەو کاتـەدا وەڵامـەکی کـت و پـڕو سەراسـیماکەر هـات، کـە دەمارەکانی بینینی، کەوا بەستەن بەچەقی بینینەوە لەمێشکدا لەناو چوون و بەتەواوی چاوی لەدەست داون، هەرچی کۆرپەلەیە بەزەبرەکەی بـاوکی لەسـکدا مـردووە. (١٠) ڕۆژی ڕێـك لەنەخۆشـخانە کـەوت، پاشان بەکوێری هاتە دەرو هیچی نەدەبینی، دار وەکـازەکی پـێ بـوو لەڕێگادا دەیکوتا. لەماڵەوە دا وەکو لاشەیەکی بێ گیان لەسەر جـێ وسەرینی کـەوتبوو، لەهـەموو لایـەك خـەم و خەفـەتی بەسـەردادا

دەبەزێ.

هەموو شتێکی لەدەستدا، باوکی لەدەستداو مرد، منداڵەکەی لەدەستدا، کەلە هەناوەکانی دا دەجولا، منداڵی ڕابردوشی هەر بەڕوداوێ مرد، زیاتر سکی دەسوتا، کە هەمیشە ئەم یادو بیرەوەریەی باوکی دەهاتەوە یاد، کەپێ ی وتبوو: (خوایە دەستم بدەی بە دەستی خۆم لە گۆڕی بنێم، تا ئەم بێ ئابڕوییەی لەگەڵدا بنێژم).

براکەی بەخێوی دەکرد، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ هەڵس و کەوتی لەگەڵدا خراپ دەبوو، بۆیە داوای لەبراکەی کرد بیباتە تەمبەڵخانە، تالەوێ بەخێوی بکەن و تەمەنی داهاتوی لەوێ دا بەسەرببات. برادەرەکەی، کە ئەو داستانەی ئەوی بۆمن گێڕایەوە، وتی: هەمیشە دوای نوێژەکان لە خوا دەپاڕایەوە خوایە تۆڵەم بۆ لەو تاوانبارە وەربگرەوە، ناویشی دەدا، ئەی خودای زیندوی بەدەسەڵات!



چیرۆکی پێنجەم:

# کچێکە بەڕووتی دەمرێ لە (البال توك)دا

بە خوا نازانم لەکوێوە دەست پێ بکەم، چۆن دەست پێ بکەم، زەوی لەبەر چاو سوڕاندم و لەشم تای گرت، نەخۆشی زیاتر دایگرتم، لە خەم و خەفەتان لاری کردمەوە، ئەمەش دوای بیستنی ئەم ڕوداوە بوو، کە ئەگەر بەسەر چیایەکدا خوێنرابایەوە هەڵی دەتەکاندو، گەر خرابایە ئاوێکی ساز گارەوە، لیلی دەکرد، گەر کەسێکی بەر لە خۆمان بیستبوای تەمەنی دوا تەمەنی لە کوڕنۆش بردندا بەسەری دەبردوو، لەو چارەنوسە خراپە دەترساو لە خوا دەپاڕایەوە بیپارێزێ و داهاتوی بەخێر بگێڕێ.

ئەم ڕووداوە لەبەرواری (١٧/١١/١٤٢٤ك) دا کات ژمێر (٣)ی شەو لە ٣/١ی کۆتایی شەودا قەوما، لەشاری (الرياض) دا. کچێکی تەمەن (٢٠) ساڵە بەناوی (س. ح ) ئەم ڕوداوەی بەسەردا هات، کە مرۆڤی دڵ ڕەق و کەڕ نەرم دەکات. ئەم کچە جل و بەرگەکانی فڕێدا خۆی ڕازاندەوە لەبەردەم کامیرای شاشەی کۆمپیوتەری تایبەتی بەخۆی، لارو لەنجەی دەکرد، وردو درشتی پارچەکانی لەشی خۆی

پیشان دەدات، دورلە بەرگ و شەرم ورەوشت دادەنیشێ، هەموو ئـەو کارانەش لەبەرامبەر بڕە پارەیەکی کەمدا، ئـەنجام دەدات، لەبـەر دەم کۆمەڵە لاوەکی هەرچی و پەرچی دا، یان کۆمەڵە گـورگێکی مرۆیـی دا، یان کۆمەڵە کەسێکی نەفس نزم و بـەدکاردا، کـە چـاکەو خراپـە نازانن و لەیەکێ لەکەشتییە بۆنگەنەکانی (بال توك)دا ژیـانی بەسـەر برد.

لەناکاو لەبێ ئاگاییەکی تەواو دا لەبەر چاوی هەمووان کچەکە بـە زەوی داو کەوت ڕاکشا، چیرۆکێکی کۆتایی دەستی پێ کرد.

فریشتەی مردن، کە ئەم ئەرکەی پێ سپێراوە دابەزیە سـەری، کـە لەکاتێدا بوو جوانی و شەرمگەی خۆی والاکردبوو، بەشەڕابی شـەیتان مەست بووبوو، تـەنیا لـەکاتی مردنـی دا بێـدار بـۆوە. ئێـستا ئـەو مردووە بێ هێزو توانایە. مـردو بـەس. بـووە لەشـێکی بـێ گیـان ، لەگیانی پڕ هەموو لەشی لەجوڵە کەوت، ئەویش بەرەو خوای گـەورە بەرز بۆوەو لەوێش دا نازانین سزای چییە؟!

ئەمە ساتێکی ترسناکی ماڵئاوایی کردنە. سەرەنجی مـاڵ ئـاوایی نەدایە باوانی، کە بانگیـان بکـات وەکـو چـاکەیێ لـەئاقار ئەوانـدا، سەرنجی ماڵ ئاوایی نەدایە قورئان، ماڵ ئاوایی یەکەی لەیادو چـاکەو بانگ کردن دانەبوو، بریا مردنەکی کـتو پـڕ بوایـە، وەکـو زۆربـەی



خەڵکی پێ ی دەمرن. بریا بەرووداوی ئۆتۆمبێل، یان خنکان، یان سوتان یان بەهۆی داڕوخانی شتێ بەسەری دا مردبوایە. خۆزگە ئاوا بوایە، ئەو کاتە کارەکە ئاسان دەبوو. بەڵام ئەو لەساتی تاونکردندا مرد، خۆزگە گەر تاوانیشی دەکرد، هەر خۆی گرتبایە و لەگۆشەی تەنیایی ماڵی دابوایە، بەڵام ئەو لەکاتێ دا مرد، کە لەبەر دەم خەڵکی دایە خراپە و ڕابواردن ئەنجام دەدات و ولاوانی بەبینینی شۆخیەکەی مەست کردووەو ئارەزوە ماتەکانی بێدار کردونەوەو ئاگری لێ بەرز کردونەوە. بەداخەوە پاشان مرد، بەڵێ مرد.....



چیرۆکی شەشەم:

# سەرەتا داوێن پاکیم لەنەخۆشخانەدا لەدەستدا

بەر لەوەی بەسەرهاتەکەم بنوسم، لەشەرمی ئەوەی ئەم کارەم کردووە تەریق بوونەوەم لە نەزانی و گەوجی و شوێن کەوتنی ئارەزووەکانی خۆم زۆر دوو دڵ بووم بینوسمەوە، بەڵام ئێستا خۆم گورج دەکەم داستانی خۆم لەگەڵ ژیاندا دەگێڕمەوە، تاوەکو هەموو ئەو کچانە بیخوێننەوە، کە وەسوەسەکانی دڵیان هانیان دەدات خراپەکاری بکەن.

من کچێکی تەمەن (٢٢) ساڵە بووم، ئەم بەسەرهاتەم نزیکەی ساڵێکە بەسەرمدا هاتووە، خۆزگە مردبام ئەوەم لێ نەقەومابوایە، خۆزگە هەر نەهاتبامە سەر دنیاوەو نەژیابامە، ساڵێکە بەسەر ئەم مەسەلەیە دا ڕابردووە، هەر ڕۆژەکی بێدار دەبمەوە خەم و پەژارەکەم و ئەوەی بە خۆم کردووە بەکۆڵم دا داوەو، لەگەڵ سەرکۆنە کردن و سەر زنشتەی خۆمدا ماندو بووم.

ڕۆژێکیان دایکم نەخۆش کەوت و بردمە نەخۆشخانە، نەم دەزانی

بۆ ئەوەی چووم خۆم لەناو بەرم، چووینە ژووری فریاکەوتن (الطواريء) و بالاپۆشی تەواوی خۆم کرد بووە بەرم، هیچ دیاردەیەکی وام نەبوو سەرنج ڕاکێش بێ، لەهێکڕا گەنجێکم بەرچاو کەوت لە چاوەڕوانی دانیشتبوو، زۆرم لێ نەڕوانی.

ئەوەی گرنگ بێ لەگەڵ دایکمدا مامەوە پشکنینەکانم بۆ کرد، چونکە بەشەکە تایبەت بەژنانەوە بوو، دەمامکم لەسەر چاوەکانم لادا. لەناکاو کە ئێمە لەچاوەڕێ کردنی پشکنینەکان دابوین دەرگاکە کرایەوە، لەو کاتەدا چاوم بەو گەنجە کەوتەوە، نەم دەتوانی دەمامك لەسەر چاوم لابدەم، یان چارۆکە لەسەر سەرم لاببەم، بەلام بە دڵگەرمی یەکی زۆرەوە لەگەنجەکەم دەڕوانی، گەنجە زۆر جوان بوو، ئەویش لەمنی دەڕوانی، ئەوە بوو توانیم دایکم هەندێ سەرقاڵ بکەم لەبەجێ هێشتنیدا، ژمارەی تەلەفۆنەکەیم وەرگرت.

لێرەوە گەشتە کورتەکە دەست پێ دەکات، بەلام گەشتێ بۆ دۆزەخ، لەیەکەم ئاخاوتن داوای لێ کردم مێردی پێ بکەم. وتم: جا چۆن ئەمە دەبێ، خۆتۆ هیچ شتێ لەبارەی منەوە نازانیت؟ وەلامی دایەوە: ئەم خۆداپۆشینەو دەمامکەی تۆ سەرنجی ڕاکێشاوم، وە چاوەکانی تۆم زۆر بەلاوە دڵگیرن.

من نەم دەزانی ڕاست دەکات، یان درۆم لەگەڵدا دەکات؟ قسەکانی

زۆربەدڵمادا چوو، پێم خۆش بوون. پەیوەندییەکانمان بەردەوام بوون، تا داوای لێ کردم لەگەڵی دابڕۆم، من چەند ساتێ لەم ڕۆیشتنەم دا دڕدۆنگ نەبووم، چونکە متمانەیەکی تەواو کوێرانەم پێ دابوو، بێگومان چەند جارێك پیاسەمان کرد، جارێکیان ماڵەوەیان بەسەفەر چوو بوون چومە ماڵیان، وە جارێکیان ماڵی خوشکی ئەوم بەسەر کردەوە، جارێکی تر شوققەیەکی سڵتەکانی بەکرێ گرت، من بۆ ئەمە جلی پیاوانم دەکردە بەر، بێ ئەوەی کەس هەستم پێ بکات. دزداشەو عەگالم دەپۆشی.

ڕۆژێکیان هەواو هەوەس لەکەللەی دام و بەوپەڕی سپۆرتی و شۆخی دابەزیم، لەگەڵیدا داچومە ماڵی خوشکی، نەمدەزانی هەموو شتێ لەدەست دەدەم و دەست خەڕۆ دەبم... ژیانم، شەرەف و ناموسم و ئابڕوم، کە جەوهەری هەموو ئەو کچانەیە شانازی بە ئابڕوو داوێن پاکی خۆیەوە دەکات. بەڵام زۆر بە ئاسانی دەستم لەهەر هەموویان کردەوە.

هەر چەند لاوەکە بەرپرسیاری هەڵگرتبوو، منیش لەو پتر بەرپرسیاریم هەڵگرتبوو، چونکە ئەو نەیدەویست مەسەلەکە بگاتە ئەو ڕاددەیە، بەڵام فریوم داو شەیتان ئەو کارەی بۆ جوانکردین، تاوامان لێ هات توشی ئەو گوناهە گەورە ببین، کەزینایە.

دوای ئەوە سەرزنشتەی خۆم کردو پەشیمان بوومەوەو وتم: خوایە چیم بە خۆم کرد وچی بکەم؟ چی بەخزم و ماڵەوەم بڵێیم؟ زۆر پرسیار لەمێشکمدا دروست بوو، تاوام هەست دەکرد چیایەکی گەورەم لەسەر سەرە، بەخۆم دەوت: تۆ چەندە هیچ وپوچیت. هەفتەیەکی نەبرد ئەم گەنجە هاتە خوازبێنیم، زۆرم دڵخۆش بوو بڕوام نەدەکرد. بەڵام کارەساتەکە لەوەدا بوو خزمانم ڕازی نەبوون، هەرچەندە گریام و پاڕامەوە بە توندی ڕەتیان کردەوە.

ئەم گەنجە نائومێدنە بوو، دوسێ جاری تر داخوازی کردم، بەڵام خزمانم پەسندیان نەکردو بە توندی ڕەتیان کردەوە، تا براگەورەکەم هەڕەشەی لەو کوڕە کرد، کە نەکا جارەکی تر بێتەوە.

گەنجەکە لەمێشکم دا نەما، بەڵام ئابڕو چونم هەرمایەوە، بەڵام تاکەی؟

ئێستا سەرگەردانم نازانم چی بکەم؟ زۆر کەس داخوازی کردم ڕەتم کردنەوە، بەڵام بەردەوام ناتوانم هەمیشە وابێنمەوە، پێویستە ڕازی ببم، بەڵام نازانم ئەو کاتەچی بکەم؟ داستانەکەم نەبڕاوەتەوە. بەهەر حاڵ (٨) مانگ بەسەرگەردانی مامەوە، جارەکی تر کەوتمە داوی لاوێکی ترەوە، دوای ئەوەی بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە، ئەو هەواڵی پێ دام ئەو دەتوانێ یارمەتیم بدات، منیش زۆرم دڵخۆش بوو، بڕوام

وابوو، کە جارەکی تر دەگەڕێمەوە بۆ باری ئاسایی و شەڕەفم بۆ دەگەڕێتەوە، نەمزانی ئەو لاوە گورگە بۆم لە بۆسەدایە!

جارێك پێ ی وتم: دەتبەمەلای پزیشکێ لەخەستەخانەدا دەتوانێ بە نەشتەر گەرییەکی سادەی نیوکات ژمێری بۆ دۆخی جاران بتگێڕێتەو.

بڕوام کرد، لەجیاتی ئەوە بڕۆمە کۆلیژ لەگەڵ ئەودا ڕۆیشتم تابمبا بۆ لای نوژدارەکە، من لەم شارەدا شارەزابووم، بردمی بۆ سەر رێگەی شار، ئەو کاتە زانیم گورگەکی دڕندەیە ڕاو دەکات، نەمزانی چی بکەم؟

هاوارم کردو زۆر گریام و پاڕامەوەو داوام لێ کرد وازم لێ بێنێ، بەڵام ئەو سوربوو، منیش تەنیا بەرگری لەخۆ کردنم بەدەستەوە مایەوە، بەتوندی بەرگریم لە خۆم کردو، ئەویش لێ ی دام و جلەکانی دڕاندم، کەزانی ناتوانێ دەستم لێ بدات وازی هێناو بۆ ماڵی گێڕامەوە، ئەو ڕۆژە وەکو مردوان بووم.

لەکۆتایی دا زانیم دوا چارەم پەشیمان بوونەوەو تۆبەیەکی یەکجارییەو لەخوا پاڕانەوەیە ، دوای خوا داوام لە خوشکەکەم کرد لەو بەڵایەدا یارمەتیم بدات، خوا دەزانی سەرم بەچی دەگات..

خوشکۆڵەکانم ئەمە ئامۆژگاری یەکە لە خوشکی خۆتانەوە

جەوهــەرو ناموســی خۆتــان بپــارێزن و بەهــەمووو گەنجینــەی دنیــای مەفرۆشن.

لەهەمووی خراپتر چەند جارێ ویستم خۆم بکوژم، بەتایبەتی کــاتێ سەیری دایکم دەکرد وەکو داوێن پاکێ سەیری کچەکەی خۆی دەکــردو نەیدەزانی ناپاکیم بە خزمانم کردووە لەڕاست متمانە بــەمن بوونیــان کاتێك من شوێن ئــارەزووو چــێژیدرۆکانم کــەوتووم ئێــستاش مــن و ناموس شکانەکەم پێکەوە لەماڵی خزمانمــداین، بــەڵام تاکــەی؟ خــوا دەزانێ.

خوشکتان (تائیبە- تۆبەکار).



**چیرۆکی حەوتەم:**

# بێوەژنەکە

بانگەوازی کارێك بەسەرهاتی بێوەژنێکی (٣٦) ساڵی بۆ گێڕامەوە، کە (٣) کوڕی هەبوون، بەهۆی ئارەزوێکی زوڕەفتەنییەوە (٣) مانگ زیندانی دەکرێ، ئەویش، بە تاوانی داوێن پیسییەوە، کە دڵ شکاوی دروست دەکات و فرمێسك لەقوڵایی چاو دەڕژێنێ، چۆن ئەء ، ئەو دایکی سێ کوڕانە! گەورەکەیان (١٩) ساڵانەیە، ئەو بێوژنە، ژنی کابرایەکی دەوڵەمەند بووە، پیاوەکەی بەهۆی ڕوداوی ئۆتۆمبیل مردووە، وەکو خۆی دەگێڕێتەوە، هەرگیز ئەو مێردە بۆ هیچ داوا کارییەك دەستی بەڕویەوە نەناوە، دوای مردنیشی پارەی زۆرو خانوبەرەو زەوی وزاری زۆری بۆ بەجێهێشتون.

ئەو دایکە چەند مانگ و ساڵی بەسەردا بردو بەبەرژەوەندی و پەروەردەکردنی منداڵەکانییەوە هەڵسا، لەژێر چەند قاتی بەر پرسیاری دا، کوڕە گەورەکەشی کاروباری ماڵەوەی لەگەڵدا هەڵدەسوڕاند، سامان و داراییش لەژێر چاودێری مامی دابوو. بەلاّم دوای چەند ساڵێك ئەو دایکە زیاد لەپێویست، بەبۆنەیەکەوە یان بێ

بۆنە دەڕۆیشتە دەرەوە، تابوو بە قوربـانی پیاوێـك، لـەبێ ئاگـایی دا ڕاوی کـردو نـاموس و ئـابڕوی دەکـوژێ، لەچـەند سـەودا سـەرێکی بەداخـداو، لێ پرسـین و چـاك وچـۆنییەکی کارەسـاتباردا، بەچـەند ڕێگایەکی گوماناوی خراپدا یەکتریان ناسی، بـێ ئـەوەی منداڵـەکان بزانن.

ئـەو پەیوەندییـە ناڕەوایـە ڕۆژانـە بـەدەنگی تەلـەفۆن و نامـە گۆڕینەوەی شەیتانی توندو تـۆڵ تربـوو، بـەوناوەی ئێمـە گـەورەین و خۆمان بەرژەوەندییەکانی خۆمان دەزانین.

منیش دەڵێم ڕێگای لەمە پاکتر هەبوو، کە ژنەکە دەیتـوانی دوای ڕەچاوکردنی نەمانی مێردەکەی لەچـەند مانگێکـدا کـە (عیددەیـە) بەڕێگایـەکی شـەرعی مێـرد بکاتـەوە، نـەك لـەڕێگای گونـاهو ناشەرعییەوە ئارەزوی خۆی تێربکات.

ڕۆژانی یەکتر ناسین ڕابردوو بـە دەریـای ئـارەزوو ئـاگری ئـاژاوەدا دەڕۆیشت، پیاوەکە فشاری دەخستە سەرکە لەگەڵی دا بڕواتە دەرەوە، تا بەدوای ئارەزوەکانی کەوت، چەند جارێ ژوانی یـەکتری یـان کـرد، ئینجا سەردانەکان زۆر بوون، تاکەوتە ناو تاوانی ناپاکییەوە... خوایە ئەم دایکە چی بەخۆی کرد؟ چی بە منداڵەکانی دەڵـێ؟ پاسـاوی ئـەو لادانە بەچـی دێنێتـەوە؟ تـا خـودی خـۆی وەکـو شـێت و هـاری لێ

هاتبوو، دیارە تاوانەکی گەورەیە و خـواش خـۆی ئاگـاداری ئەوەیـە. کاتێ ئەو پیاوە ئابڕووی شـکاند، کـە لەچـڵە پۆپـەی ئابڕومەنـدی و ڕووسپیت دابوو، مافی مێردو منداڵەکانیشی پشت گوێ نەخستبوو، چۆن ئەوە ڕونادات؟! ئەو پیاوە زۆر قسەی درۆو بەڵێنی سـاختەی پـێ دابوو، کەبە بـەنج کردنـی مەعنـەوی و دیـەنی سێکـسی کوشـندەو بەسەرهاتی ڕوتی لەناوبەر کۆتایی دێت.

ئەوەی گرنگە خودا مۆڵـەتی دایـە، بـەڵام پـشتگوێ ی نەخـست، دایکەکە بەکەلەپـچە کـراوی ڕەوانـەی زینـدان کـرا، بـەپێ ی دەقـە شـەرعی یـەکانی سـزای کردەوەکـانی خـۆی چـێژت، سـزای ئـازارو خەمەکانی خۆی نۆشی، مامی منداڵەکانیشی نـەهات ئـەم تاوانـەی ئاشکرا بکات و بەهانەی بۆ هۆیەکانی زیندانی بوونی‌بۆ منداڵـەکانی ژنەکە دەهێنایەوە، چونکە ئاشکرا کردنی ئەم تاوانە زیانی هەیە نـەك سود، فرمێسك دادەبارێنێ نەك دڵخۆشـی کـەربێ و، نـاکۆکی پەیـدا دەکات، نەك تەبایی ورێکی، ئابڕودەبات نەك دایدەپۆشی. ئـەی ئـەو دایکە بەسۆزە چـی بەمنداڵـەکانی بڵێـت؟ ئـەوان چـی بکـەن؟ چـی دایکیان خستۆتە قـوژبنی زیندانـەوە؟ ئایـا دایکمـان تـاوانێکی وای کردووە شایانی بەندیخانە بێت؟



بــەڵێ ئــەو ئەوپرســـیارانە سەراســـیماکەرن، وەڵامێکـــی تـــەواو لەدەروونی مـنداڵەکانی دانەبینی کە قەناعەتیان پێ بکات.

ئەوانە وەکو ئاهو ناڵە و پەشیمانی لەوسەردانە یەك بـە دوایەکـەی هەفتانەیانــدا دەردەکــەوت، کــە منداڵــەکانی ئــەنجامیان دەدات، لەکاتێکدا ئەویش لەسوچی زیندانی دایە.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو خەمانەشدا، ڕووخۆشی بەدەم وچـاوی ئـەو بێوەژنە ئەو دایکە گەڕاوەو تـۆ بـەکارەوە دەبینـرا، کـە نهێنییەکـەی پاراستووە، کە سەرانی ڕەش سپی دەکات، کەسانی وەکو ئەو بەرگەی ناگرن.

ئەو دایکە زیندانییـــە کاتــژمێرو خولــەك و چـرکەی دەژمــارد بــۆ سەردانی منداڵەکانی، زۆر لەوەش دەترســا هۆکــاری زینــدانی بــوونی ئاشکرا ببێت.

سەرباری ئەوەش منداڵەکان زۆر تامەزرۆی بینینی دایکیان بــوون، چونکە بە دوری و لەدەست دانی ئەو سام گرتبوونی، بێ دایك ژیــان، کە ژیانەکی پڕ لەکۆسپ و تەگەرەو خەمیان بەسەر برد کاتــێ ناویــان هەر لەسەردەم بو دەیان وتەودو ئەو ماڵــە فراوانــەیان لێــك وەتــەنگ هاتبوو، گوڵی ماڵ سیس بوو بوو، تــەنیا بـۆنی ڕێحانەکـەی مــابۆوە وەکو یادگاری، واتای خۆشەویستی لەدڵی منداڵەکانی دا لــەناو چــوو

بوو، لەخەندەکانی تەنیا فرمێسکی گەرم و گورِو ئەو پرسیارە مابۆوە!
بۆچی دایکمان بەند کراوە؟ تاوانی چییە؟ کەی لەزیندان دێتە دەرەوە؟
کەی بۆلامان دەگەرِێتەوە؟ بریا زوبایە، چونکە دایکێکی باش بوو، دەریاییێك بوو لە خۆشەویستی با هەڵەیەکیشی کردبێ، ڕووبارەکی لەبن نەهاتووی سۆز بوو، باساتمەیەکیش کردبێ، تاڤگەیێ بوو لەبەزەییەکی نەبڕاوەو، بەهەڵەو لەخشتە چونێك وشك نابێت.

## چیرۆکی هەشتەم:

# خۆشەویستی ساختە

ئەم کچەیەش دەکەوێتە داوی گەنجێکەوەو لە کۆتاییی دا بۆ شـرواڵ پیـسی رادەکێـشێ ، پاشـان نـاموس و ئـابڕوی لەکـەدار دەکـات. دەکەوتێە سۆراغ و گەڕان بەشوێنیدا، دوایی دۆزییەوە. تۆڵە سەندنەوە بووە بەشێکی گـەورە لـەژیانی ئـەو، چـۆن تۆڵـە لەکەسـێ بکاتـەوە شەرەفی بردووە، لەکچێنی کـردووە، درۆی لەگەڵـدا کـردووە، پاشـان ویڵێ کچێکی تر بووە، وەك هیچ ڕوینـەدابێت و مێشیـشی میـوانی نەبووبێت.

ئەو کچەیە دەستی کرد بە فریـودانی ئـەو کوڕەیـە گوایـە خۆشـی دەوێ و حەزبە ژوانی ئەو دەکات، پاشان لەو شوققەیەدا ژوانـی یـەك دەکەن، کە ئەو تاوانەی تێدا کرابوو، لەوێدا شـەوە شـوم ورەشـەکەی سەری هەڵداوە ئەمەش گڕی تۆڵەکردنەوە لێـی زیـاتر کـرد، داوای لێ کرد ئەو شەوخونییە بە شەڕاب و مەی ڕازاوە تربکەن، کاتێ کوڕەکـە بەتەواوی مەست و سەرخۆش بوو، چـووە چێـشتخانەکەو چـەقۆیەکی هێنا چەند چەقۆیەکی لێدا تا ئاگری دڵی دامرکێنێتەوە.

کاتێ مرد بردییە سەربان بەنزینی پێدا کردو ئاگری پێدا کرد، بۆیەش سوتاندی تا بەتەواوی لەبەر چاوی بزر بێت.

پاشان گیراو ڕاپێچی زیندانی کرا، لە پشت شیشەکانی زیندانەوە دوای چێژتنی تاڵی ئەوێ، دەیەوێ بە هەموو ئەو کچانە بڵێ، کەتوشی ئەو خۆشەویستییە قەڵبەو ساختەیە بوون و گرفتاری ئەو تراژیدیایە ترسناکە هاتوون، ئەوە بەسەرهاتی منەو کۆتایی تاریکی منەو، نوسیومە، تا ببێ بەپەند بۆ ئەو کچانەی نەزانن و بەشوێن کامەرانی دا وێڵن، سۆراغی مێردو ئارامی خێزان و ئارامی دەرونی دەکەن، ئەمەش لە ڕێگای موبایل و ڕۆیشتنی کوێرانەی بازاڕو تێکەڵ بوون بە پیاوان و تۆڕی ئەنتەرنێتەوە، من بەو خوشکانە دەڵێم: خوشکم ئەو ڕێگایەت هەڵەیەو وازی لێ بێنە، تاکات ماوە وشیاربیەوە، بەر لەوەش ناموس و ئابڕوو ئایندەو لاوی و خێزانت لەدەست بدەیت.. ئاگاداربە لە گورگانی خۆشەویستی ، نەکەی قوربانی داهاتوو بی، بەختەوەر کەسێکە پەند لەکەسانی تر وەردەگرێت...



چیرۆکی نۆیەم:

# بۆچی خۆی سوتاند؟

یەکێکیان نوسیویەتی و دەڵێ: من بەسەرهاتێکیان بۆ باس دەکەم، کە برادەرێکم، ڕۆژێکیان وەکو جاران بەڵێن بەبرادەرەکەیان دەدەن شەونخونی بکەن بۆ ڕابواردن، برا دەرەکەی دەڵێ. من ئەو شەو نێچیرێکم گرتووە، ئیمشەو لای من ژنێکی زۆر شۆخ و شەنگت پێشکەش دەکرێ، کەهەرگیز لێی وەڕس نابی، شەو بەڵێنەکەی بردەسەر، بەڵام ئەو برادەرە نازانێ ژنەکە کێیە؟ ئەو ژنەیە لەیەکێ لەشوقەکاندا لەگەڵ برادەرەکەی دا ئامادە دەبێ و، پێ ی دەڵێ: بچۆ چابێنەو خۆمان بۆ جوان بکە، برادەرەکەشی لە هۆڵی شوقەدا دانیشتووەو سەیری تەلەفزیۆن دەکات. دوای چەند ساتێ ژنەکە بەچاوە دێتە ژور، ئای لەو کارەساتە، کاتێ برادەرەکە دەکەوێتە بەر چاوی سام دەیگرێ و زمانی لاڵ دەبێ، برادەرەکەی تێبینی حەپەسانەکەی کردو سەری سوڕما!

بەڵام ئەو ژنەکێ بێ؟ ئەبێ ڕاستی ئاشکرابێ! ئەوە بۆ برادەرەکەی شوقەکەی بەجێ هێشت و لەبەردەگاکە وتی: تۆ هەرسێ تەلاقت



کەوتبێت ئەو کاتە برادەرەکەی زانی ئەمە ژنی هاوڕێکەی بووە.

ژنەکە دەستی بەگریان کرد، بەلاّم لەو هەلّوێستەدا گریان دادی چی دەدات، ئەو گریانە جوانە، کە بەرلە تاوانکردن ئەنجام دەدرێ، ئەوەی گرنگ بێ ئەم تاوانەی بە تاوانەکی ترچاك کردەوە، ئەوەبوو خۆی سوتاند – خوا پەنامان بدات – دوای خۆکوشتنی مرد. خوایە ئێمەو خێزانمان و وەچەکانمان و بڕواداران لەهەموو خراپەیەك چەپالّە بدەیت ( یاارحم الراحمین).



**چیرۆکی دەیەم:**

# شوێنێکی بەڕەڵایی

ئەم چیرۆکەوانە دەگێڕێتەوە: برادەرێکی زۆر خۆشەویستم هەبوو، وەکو برایەکی من وابوو، هەفتەی ڕابردوو لەڕوداوی هاتوو چۆدا گیانی بەخوا سپاردو، خوا ڕوحمی پێ بکاو ئارام بەخزم و کەسانی ببەخشێ. ئەو برادەرە کۆمەڵە پۆستێکی بەڕەڵایی و وێنەی ڕوتی لابوو، خوا پەنامان بدات، شوێنێکی بەڕەڵایی هەبوو، لەوێنەی سێکسی پێك دەهات. کارەساتەکە لەوێ دابوو هێمای نهێنی ئەو شوێنانەمان نەدەزانی ڕەشیان بکەینەوە، بۆیە نەمان توانی، ئەی خێر خوازان ئەو پیاوە لەسەر دارەمەیت دانرابوو . وێنەی سێکسی ڕەوانە دەکرد ﴿حسبنا الله ونعم الوكيل﴾.

دایکی لەخەونی دا دەبینێ منداڵان بەسەر گۆڕی دارەت دەبن و میزی بەسەردا دەکەن. ئەو بەستەزمانە هەستی بەو کارە شاراوانە نەکردبوو!!

بەخودای ئەو منداڵانەی میزیان بە گۆڕیاندا کردووە، ئەوە ئەوانەن کە ئەو وێنانە بۆ جێگای ئەو ڕەوانە دەکەن لەسەر ئەنتەرنێت!

لەم بارەوە لەگەڵ ئەو کۆمپانیایە قسەمان کرد، کەئەو وێنانە ڕەوانەی شوێنەکە دەکات، ئەوانیش وتیان ئێمە هیچمان لەتواناادا نییە!!

ئەی خەڵکینە کابراکە مردووە، ئاسەوارەکانی خوێن لەدڵمان دێنێ، تاکەی ئەو دۆخە دەوام بکات؟ ئەو جێگایە پیسە خراپەی دەرحەق دەکات، ئەمەش بەشێکە لە وەسوەسەکانی مرۆڤ و جنۆکە، خوا پەنامان بدات لەو جێگایانە!

تکام وایە ئەم نامەیە پەخش بکەن بەخەڵکی زەوی بگەیێنن تاکاتیان لە دەستدا ماوە، ئەوانەی شوێنی (سێکس) یان لەسەر ئەنتەرنێت هەیەیان کۆمەڵەی پۆستی بەڕەڵایی یان هەیە، یان بەشدارییان لەگەڵدا هەیە، پێیان دەڵێم بەخودا ئەوانە دادت نادەن، کاتێ ئەو خراپکارانە لەڕۆژی دوایی (زیندوبوونەوە) تەنیا پەشیمانی و ئاخ و داخت پێ دەبەخشن، ئەو کاتەش پەشیمانی سودی نابێت.

﴿وحسبي الله ونعم الوكيل﴾.

**چیرۆکی یازدەهەم:**

# کچێك لەڕەمەزاندا

ئەم ڕوداوە ڕاستە لە غەززەی فەلەستیندا ڕوودەدات.

کچێکی مۆدە دەبێ، زرۆ شۆخ و بەرچاو دەبێت، لەنیوەی پیرۆزی مانگی ڕەمەزانی ڕابردوودا سواری تاکسییەکی بەکرێ دەبێت، ئەم مۆدەیە بەرچاوو سەرنج ڕاکێش دەبێت، ئەم وێنەیە سەرەنجی شوفێری ئۆتۆمبێلەکە ڕادەکێشێت، بۆیە بەقسەی شیرین دەیدوێنێت، کە خۆی داپۆشێ و لەخوا بترسێ، بەتایبەتی لەورەمەزانە پیرۆزەدا، کە گوناهباران تێیدا ڕوو لە خوا دەکەن.

بزانە کچەکە وەلامی چی دەبێت! ئەو بەو دەستەواژەیە وەلامی دەداتەوە ها ئەم موبایلە بگرە قسە لەگەڵ خوای خۆت بکە با جێگایەك لە دۆزەخدا بۆ من دەست نیشان بکات و جێگایەك بۆتۆ لەبەهەشت دا دیاری بکات.

وەڵامی خوداش خێرا بوو، وەڵامی نزاکەی دایەوە، گورج گیانی کێشاو لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا مرد. دەست بەجێ شوفێرەکە بەرەونەخۆشخانەی برد، کچەکەیان بۆ بەفرگری نەخۆشخانە برد،،

کاتێ خزمەکانی تەرمەکەیان دۆزییەوە، هاتن مردوەکە ببەنەوە، لەبەفر گرەی خەستەخانەی (الشفاء) یان دەرهێنا، بینیان دەم و چاو و پشتی ڕەش هەڵگەڕاوە (خوا پەنامان بدات). هەتا نەیانتوانی موبایلەکەی لەدەست دەربێنن، تا ببێ بەشاهید بەسەریەوە لەپەسلاندا (خوا دوا ڕۆژمان بەخێر بگێڕێت- یاارحم الرحمین).

**چیرۆکی دوانزهەم:**

# پیرەمێردێکی پیس و نەگریس و منداڵێکی بێ تاوان

زۆر بەسەرهات و داستان دەبیستین دڵمان دەهەژێنێ، زۆر داستان هەیە کاریگەرەو هزر لەبەرامبەر ئەنجامدەرانی ئەم کارانەدا کاس دەکات، بەڵکو مرۆڤی هۆشیار لەبەرامبەر بکەرەکانی ئەم کارانەدا دەکەوێتە گومانەوە، کە ئایا چۆن دەبێ ئەوانە ئادەمی بن؟ چونکە هەڵوێستەکە زۆر گەورەیە و لەش دەلەرزێنێ و منداڵان لەڕاست ئەم کارەساتەدا پیر دەکات. هەرچی ئەم بەسەرهاتەیە لەهەموو بەسەر هاتەکانی تر جیاوازە، خوێنەر وەکو ئەندێشەیەکی هزری بڕوای پێ دەکات، ڕودانی ئەم کارەساتە بەسەر هیچ دڵێکدا نایەت کەمرۆڤ بێ و ناوەڕۆکی خێرو شەڕی ژیان تێ بگات. بەڵام داستانەکە ڕاستەقینەیەو لەبەر چاو و گوێی زۆر کەس ڕویداوە، ئەمەش پوختەی بەسەرهاتەکەیە:

هەرچەندە ئەم منداڵە، کەهێشتا (٧) ساڵەی نەبڕی بوو، لەگەڵ هاوڕێکانی دا یاری دەکرد، ئەوانە گەمەیان دەکردو بیری منداڵییان لەتەماعی کلۆڵەکان و قۆرغ کردنی گورگە مرۆیی یەکان، بێ ئاگا

بــوو، کــە گۆشــتی هــەزاران و دامــاوان بــێ ســۆزو بــەزەیی لێــك هەڵدەوەشێنن. کاتێ منداڵەکە دورلە هاورێیانی بەتــەنیا ملــی ڕێگــا دەگرێتەبەرو دەست بەوتنی گۆرانی خۆش دەکات. بێ باکە لەخــەڵکی دەوروبەری و متمانەی تەواوی پێ یانە، بەتایبەتی دراوســێ و خــزم و خــەڵکی گەڕەکەکــەی. لــەپڕ پیــاوێکی تەمــەن (٥٧) ســاڵی بــە ئۆتۆمبیلەوە دێتە پێش منداڵەکەو بۆی ڕادەگــرێ و دەڵــێ: ســواربە، منداڵەکەش سەیری ئەو پیاوە دەم بەخەندەیە دەکات ودڵی بــەبینینی دەگەشێتەوە، چونکە دراوسێ یەکی خۆشەویستی ئەوانەو چاکە خوازو خەڵکی ئەو گەڕەکەیە وەکو باپیرەشی نەبێ لەشــوێنی بــاوکی ئــەوە. ئەوە گرنگە منداڵەکە ســواری ئۆتۆمــبیلەکــە دەبــێ وزۆر کامــەران و شادە وبێ ترس وباکە، بێ ئاگایە لەنیازی گڵاوی ئەو پیــاوە ناپــاك و سپڵەیە، دڵ مرداربووە، بەڵکو هیچ دەســتەواژەیەکم دەســت ناکــەوێ گوزارشی پێ لەو خراپکارە بکەم.

منداڵەکە بەوپەڕی کەیف خۆشی سواری ئۆتۆمبیلەکە دەبێ، چــۆن نا!

ئەو کابرایەی خۆش دەوێ و دراوسێ یەتی و هاورێ ی باوکییەتی، پاشان پیاوە ڕاست و چەپی خۆی دەڕوانێ تابزانێ کەس چاوی لێیانــە، کەزانی کــەس دیارنییــە پێــی بەئۆتۆمبیلەکــەوە نــا کەئــەو منداڵــە



نیازپاکەو ئەو پیاوە پیس و چەپەڵەی پێکەوە کۆکردەوە.

ئۆتۆمبیلەکە دورلە چاوی خەڵکی لێ دەخوڕێ دەیباتە دارستانێکی گەورە، کە بەئاسانی خراپکاری و کاری نەفس نزمی تێدا ئەنجام بدرێ. ئۆتۆمبیلەکە ڕادەگرێ و ئەم خراپکارەدادەبەزێ و داوای لەمنداڵەکەش دەکات دابەزێ. ئەنجا منداڵەکە دادەبەزێ و دەپرسێ من لەکوێم؟ ئەم جێگایە نامۆیە کوێیە؟ بۆچی ئەم پیاوە منی بۆئێرە هێناوە؟ زۆر پرسیاری تر مێشکی منداڵەکەی سەرقاڵ کردبوو! بەڵام هیچ سەری لە مەبەستی ئەم خراپکارە دەرنەکرد. منداڵەکە هەر لەو خەیاڵانە دابوو، کە پیاوەکە وەکو هەور گرماندی و زەوی دەهەژاندو منداڵەکەشی لەشادمانییەوە خەمبارکرد وبێ باکیەکەی لێ گۆڕی بەترس، دەنگێ بوو پیس ترین و پیسترین وشەیان هەڵگرتبوو، پێ ی دەڵێ: جلەکانت دابکەنە. منداڵەکە دەڵێ: بۆچی مامە؟ پیاوەکە: کوڕە زوکە کات مەڕووێنە. ئەو کاتە منداڵەکە هەستی بەنیازی خراپی کابراکە کرد، بۆیە دەستی بەپاڕانەوە کرد دەڵێ، توخوا مامە بمبەوە لای دایکم ئێستا زۆر نیگەرانی منە. پیاوەکە وتی: کوڕە دەمت داخەو کاتی قسەکردن نییە، زوو جلەکانی بەرت دابنێ. منداڵ هاوار دەکات فریام کەون، بەڵام کەس نییە بێتە فریاڕەسی. پیاوەکەش دەست دەکات بەلێدانی

منداڵەکەو هەموو جلەکانی لەبەردا دادەڕنێ، پیاوەکە منداڵەکە دەخات بەپشتاو، منداڵەش نازانێ لەترسان و نەلەبەر ئازار هاواربکات، کەسیش نییە بەزەیی پێدا بێتەوە.

منداڵەکە هەر لەهاوارو پاڕانەوە دابوو مامە توخوا بەسە بمبەوە ماڵەوە، مامە توخوا بمبەوە ماڵەوە لای دایکم. بەڵام ئەم پیاوە گوێ ی بۆشل ناکات و بەردەوام دەبێ لە تاوانە قێزەونەکەی، کاتێ پیاوەکە لەسەری هەڵدەستێ ، کە گەرمایی خوین وەکو جۆگا لەبەر کۆمی منداڵەکە دەڕوات و توشی خوێن بەربوونی دەکات، پیاوە سەرسام دەبێ، باشە چی بکات، منداڵەکە دەرمان دەکات شایەد خوێنی بوەستێ، بەڵام خوێن هاتنەکە زۆرلەوە زیاترە کە ئەو هەوڵی ڕاگرتنی بدات. ئەی چی بکات تا تاوانەکەی بشارێتەوەو ئاشکرا نەبێ، هیچ ڕێگایەکی نەدۆزییەوە تەنیا کوشتنی منداڵەکە نەبێ، بۆیە تاوێرەکی دەست دایەو سەری منداڵەکەی قەڵاشتەوەو کوشتی، بەم شێوەیە شەیتان وەسوەسەی بۆی کرد. ئەم گیانەش بۆلای کردگاری گەڕایەوەو منداڵەکە بەدزێوترین شێوە مرد، کە مرۆڤایەتی بینیویەتی، منداڵەکە بەکەوتویی لەو گۆڕەی لەدارستاکە فڕێ دەدرێ، بێ کەس و یاوەر دەمێنێتەوە، پیاوەکەش دێتەوە ماڵەوە وەك بڵێ ی هیچ ڕوی نەدابێت. ئێوارە دایکەکە زیاتر ترس فشاری بۆ دێنێ و هاوار دەکاتە مێردەکەی کوا کوڕەکەم برۆ بەشوێنی دا بگەڕێ، باوکە سەر گەردان

و تاساوەو هاوار دەكات كوا كوڕەكەم بۆ كوێ چووە؟

بێ وەڵامە: جوابە! باوكە بەتاساوی لەماڵ دەڕواتە دەرو نازانێ چی بكات، لەكوێ لەمنداڵەكەی بگەڕێ؟ لەكێ بپرسێ؟ توشی پیاوە خراپكارەكە دەبێ ولێ ی دەپرسێ: هادەبینم پەشۆكاوی چی ڕویداوە؟ باوك:

بەڵێ! منداڵەكەمان دواكەوتووەو پەریشمانم.

پیاوە خراپەكە: ئایا هیچ ئاوا درەنگ هاتۆتەوە؟

باوك: نەخێر یەكەمجاریەتی بۆیە دوودڵی كردووم.

پیاوە خراپەكە: ڕەنگە لای خزمێكی بێت؟ باوك: دوورنییە!

پیاوە خراپكارە: بۆیە ئۆتۆمبیلی من بەدوای دا نەگەڕێین؟

باوك: ئاخر ئازارت دەدەم!

پیاوە خراپكارەكە: تۆچی دەڵێ ی ئێمە كوڕی یەك گەڕەكین و برای یەكترین.

باوك سواری ماشێنەكە دەبێ پێكەوە سۆراغی منداڵەكە دەكەن و دەڕۆنە ئێرو ئەوێ، بەڵام بێ ئاكام دەبێت!.

دوای نائومێد بوونی باوك، خراپكارەكە دەڵێ: بۆ بەپیاوانی ئاسایش نەڵێین؟

باوك: كارێكی باشە. ئەوە بوو دووبە دوو چونە مەڵبەندی ئاسایش و وون بوونی منداڵەكەیان ڕاگەیاند. پیاوانی ئاسایش دەكەونە گەڕان

و زۆرنابات منداڵە دەدۆزنەوەو نقومی خوێنی خۆی بووەو مردووە.

ئەو پیاوە خراپکارە پرسەی منداڵەکە دەکات و لەگەڵ جەنازەکەیدا دەڕوات و خواردنی تازییەکە دەخاتە سەرشانی خۆی، تاوەکو تاوانەکە لەخۆی دوربخاتەوەو کەس هەستی بۆ نەڕوات. بەڵام خوای گەورە جڵەوشل دەکات، بەڵام پشتگوێ ی ناخات، زۆری نەبرد شانەکە لەسەر ئەودا شکا، گەواهی لەسەر درا، کە دواجار لەگەڵ ئەم پیاوەدا بینراوە و، کەسێك بەچاوی سەر بینیویەتی سواری ئۆتۆمبیلی ئەو بووە، ئەمەش لەدوای گەڕانەوەی دابووە، لەیاری لەگەڵ برادەرانی دا.( الم یعلم بأن الله یری- نازانێ خودا دەبینێت)؟

دوای فشارخستنە سەر پیاوەکەو زۆر پێداچون لەگەڵ دا دانی بەو تاوانە دزێوەی نا، تابیگەێنێتە ژێرپەتی سێدارەو دزێوترین تاوان، کە مرۆڤایەتی بینیویەتی لەدوای خۆیەوە بەجێ بێڵێت. پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێین: هۆکاری تاوانەکانی ئیمڕۆ یەکەم شت بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کاربە دەستان نەرم کێشی دەکەن لەڕاست خراپکاریەکانداو لەکاتی تاوانکردنی لەو تاوانبارە ناپرسرێتەوە، تاوەکو ئەنجامی نەدات، نازانن بێ دەنگی کردن لەتاوان بۆ خۆی تاوانە.

دووەم: کەمترخەمی باوانەکان لە پەروەردەی منداڵەکانیان، بەشێوەیێ منداڵ لە ماڵ دەڕواتە دەرو لێ ی ناپرسرێتەوە.

چیرۆکی سیازدەهەم:

# نکۆڵی کردن لەمافەکانی خەڵکی

(تورکی موحەممەد) دەگێڕێتەوە: بڕی (٢٠٠) ملیۆن ڕیاڵم لە پیاوێ وەرگرت تایەکێك لە پڕۆژەکانم تەواو بکەم، دوای کۆتایی هاتنی ماوەی قەرزەکەم خاوەن ماڵەکە هات بڕە پارەکەی بدەمەوە، بەڵام من دەرم کردوو خۆم لێ نەناسکرد، کە ئەو هیچ قەرزی بەمن دابێ ئینجا ئەو هیچ بەڵگەو شاهیدەکی لە من نەگرتبوو.

نەمدەزانی بەم ستەمە چیم بەسەر دادێ، دوای سێ مانگ لەسەودایەك بەبڕی نیو ملیۆن ڕیال زیانم لێکەوت، هەر لەوکاتەوە هەر زیانم دەکرد، هاوسەرەکەم ئامۆژگاری کردم کە قەرزەکە بدەمەوە خاوەنەکەی، چونکە لەسەر خۆبەزلزانی و گوێ نەدان بەچاودێری خوایی سووربووم، تاوام لێهات خۆشەویسترین ئازایزانم لەدەست دا، ئەوە بوو سێ کوڕم لەڕێگا دەگەڕانەوە بەڕووداوی ئۆتۆمبێل مردن.

دوای ئەو ڕوداوە ترسناکە بێ دوودڵی مافەکەم بۆ خاوەنەکەی گێڕایەوە، داوای لێ بووردنم لێ کردو، داوام لێ کرد بۆم لە خواپپاڕێتەوە لە ژنەکەم و کوڕە حەوت ساڵەکەم بێ بەش نەکات، دوای خوای گەورەم ئەوانم بۆ ماوەتەوە.

**چیرۆکی چواردەهەم:**

# تاوانبار کردنێکی ناڕاست

(نورە عبداللە) ئافرەتێکی مامۆستایە و دوو جار تەڵاقدراوە، ئەو دەڵێ: بەسەرهاتی من لەگەڵ ستەمدا بەرلە (٧) ساڵ ڕویداوە، دوای تەڵاقدانی یەکەم بڕیارم دا شوبە خزمەکی خۆم بکەمەوە، کە ژیانەکی بەختەوەری لەگەڵ ژنەکەی و منداڵەکانی دابەسەر دەبرد. لەگەڵ کوڕی پلکمدا ڕێك کەوتم کە مێرد بەو پیاوە بکەم، کە ئەو حەزی لەژنەکەی دەکرد. وە بڕیارم دا مێردی پێ بکەم چونکە ناپاکی بەهاوسەرەکەی دەکات، تا ئەو ژنەی تەڵاق بدات و کوڕی پور (پلك)م مارەی بکاتەوە، پاشان خۆم مێرد بەو پیاوە بکەمەوە. دەستمان کردبە بڵاوکردنەوەی پڕو پاگەندەی درۆ و بوختان بەناو خزماندا، دوای ماوەیێ پلانەکەمان سەری گرت و ژیانی هاوسەرییان ئاڵۆزی تێ کەوت، تاسەری کێشا بۆ تەڵاقدان. ئەوەبوو جیابوونەوە تەواو بوو. ئینجا هەڵوێستە دەکات و فرمێسك بەچاوەکانیەوە دێنە خوار، تابڵێ: دوای ساڵێك ژنی ئەو پیاوە مێردی بە پیاوەکی پایە بەرزکردەوەو ئەو پیاوەش کە ژنم پێی بە تەڵاقداندا ژنێکی تری هێنا.



بەهەرحاڵ خۆم وکوڕە پورم بە ئامانجمان نەگەیشتین، بەڵکو بە ئاکامی ستەمەکەمان گەیشتین، خۆم توشی شێرپەنجەی خوێن بووم و کوڕی پوریشم لەگەڵ گەواهیدی دووەم دا لەناو شوقەی خۆیدا بەهۆی کارەبا گرتن سوتان و بوونە خەڵوز، ئەمەش دوای ئەوەی سێ ساڵ بەسەر بابەتەکەدا تێ پەڕی .

چیرۆکی پازدەهەم:

# وێران بوونی کێڵگەکەم (المزرعة)

(سەعد سالم) دەڵێ: کێڵکەیەکی تایبەتی خۆم هەبوو پارچە زەوییەکی کشتوکاڵیشی بەتەنیشتەوە توخب بوو، زۆر لەگەڵ خارەنەکەی دا هەڵدا دەستی لێ بکاتەوە بۆمن، بەلاّم وازی لێ نەهێنا.

لەئاکامدا هەوڵمدا گەریەزۆری و هێزیش بێ پارچە زەوییەکەی لێ بستێنم، بەتایبەتی دەشمزانی هیچ بەڵگە نامەیەکی وەرەقەیی نییە بیسەلمێنێ لەباوکییەوە بەمیراتی گرتووە. بۆیە چووم دووشاهیدو گەواهیدەری ساختەم بەبڕی (٦٠٠٠٠) دینار بۆ هەر یەکێکیان بەکرێ گرت، کە لەبەردەم دادگادا گەواهیم بۆ بدەن، کە خاوەن شەرعی و یاسایی ئەم زەوییە منم. ئەوە بوو دوای چەند دانیشتنێکی دادگایی زەوییەکە بوویەماڵی من.

پاش ئەوە زۆر هەوڵمدا ئەو زەوییە بکەمە کشتوکاڵ بەلاّم بێ سود بوو، هەرچەند شارەزایان بەمنیان ڕاگەیاند، کەخاکەکی بۆ کشتوکاڵ بەپیتە هەرچی زەویەکەی خۆم بوو، وادەی درونەوەی داهاتوو،

بەربوومەکەی دەردە مێروی بۆ هات ماڵەکی زۆرم لە دەستدا، سەرباری ڕوداوی تر، کە خەریك بوو سەرم بخوات.

لەکۆتایی دا زەوییەکەم دایەوە خاوەنەکەی، ڕەنگە بڕوانەکەی گەربلێم، ئەو خاکە بێ پیتە زۆرلە خاکی من بەپیت تر بەرهەمی هێناو، دوای ئەوە مێروەکانیزەوی من بزربوون، سوپاس بۆ خودا کە حاڵی کردم ئەم زەوییە زەوت کراوە بدەمەوە دەستی خاوەنەکەی، ئامۆژگاری هەموو کەسێك دەکەم چاوی لەزەوت کردنی خاکی کەسانی تر نەبێت سود لەمن وەربگرێ، ستەمکردن سەرەنجامەکی خراپی دەبێت.

**چیرۆکی شازدەهەم:**

# بێ ئابڕوویی قوتابی یەك

(حمد بدر) دەڵێ: بەر لەهەشت ساڵان كاتێ لە قۆناغی ناوەنـدی دا قوتابی بووم، لەنێوان من و قوتابیەكی زیـرەك دا شـەڕو مـشتومڕێك رویدا، بۆیە بڕیـارم دا بـەهۆی ئـەو شـەڕو هەرایـەوە كـاری وابكـەم داهاتوی لەناوببەم.

ئەورۆژە ڕەشەم لەیاد ناچێتەوە، كە ڕۆژێكیان شەیتان خوت خوتەی بۆ كەڵكەڵەم كردم، كاتێ بەیانی چوومە قوتابخانە كۆمەڵێ سـیگارەی حەشیشم پێچابونەوە، كە بەیەكتریان دەدا، هاتم خستنمە ناو جانتـای ئەو قوتابییەوە، ئینجـا قوتابیـەكم ئاگـادار كـردەوە، كـە بـەپۆلیس ڕابگەیەنێ قوتابخانە ماددەی هۆشبەری تێ دا ڕەواج دەدرێ وكەسـانێ بەم كارە هەڵدەستن. ئەم پلانە شەیتانی یە سەری گرت، ئێمـەش ئـەو گەواهیدەرە بووین كە ماددە هۆشبەرەكانمان بەكاردەهێنا.

هەر لەو ڕۆژەوە دەبێ باجی ستەمەكانم بدەمەوە. من بووم تۆمەتم بۆ هەڵبەستبوو، بەرلە دوو سـاڵ توشـی ڕووداوی ئۆتۆمبیـل بـووم و دەستی ڕاستم لەدەستدا. دوای ڕوداوەكە سەرم پێ بردو چـومە مـاڵی

داوای لێ بوردنی لێ بکەم، بەڵام بەتوندی ڕەتی کردەوە، چونکە مـن لەناو خزمانی دا ئابڕوم برد، بەهۆی ستەمی منەوە خەڵکی پەڕاوێزی کردبوو، ئەو پێ ی ڕاگەیاندم شەوانە نزای شەڕت لێ دەکەم، چونکە بەهۆی ئەو ئابڕو چوونە هەموو شتێکی لەدەست کرد بوو.

ئینجا بەهۆی ڕوداوی تر گۆج و ئیفلیج بووم و بەکورسی پاسکیل نەبێ ناتوانم بخولێمەوە. ئیمڕۆ ژیانێکی کلۆڵم هەیە، ئەوەی لەهەموویان زیاتر لێ ی دەترسم، مردنە، چونکە لەسزاو لێ پرسینەوەی خوا دەترسم، داواکارم لەخوا لێم خۆشبێ و دڵی ئەو کابرایەشم بۆ ڕازی بکات، چاو پۆشیم لێ بکات.



**چیرۆکی حەڤدەهەم:**

# لە زانکـــۆدا

لەیەکێ لەکۆلیژەکانی دەوڵەتەکی عـەرەبی دا، قوتـابییێکی دورلـە ئاین، لەکاتژمێر خۆی ڕادەمێنێ و هاوار دەکات: (گەر ڕاست دەکـەن خـودا هەیـە، باپـاش کاتـژمێرەکی تـر بمرێنێـت. بێگومـان ئەمـە دیمـەنێکی مـوعجیزەیی بـوو حەشـامەتێکی زۆر لـە قوتابیـان و مامۆستایان بەچاوی خۆیان بینیان، بە پەلە خولەکەکان تێ دەپەڕین، قوتابیەکـە بـە لـەخۆبایی بوونـەوە هەڵـساو ملبەملانـەی کـردو بـە هاوڕێیانی وت. بینیتان گەر خودا هەبوو منی دەمرانـد، قوتابیـەکان ڕۆیشتن، هەبوو لەو قوتابیانە شەیتان وەسوەسەی بۆ کردو، هەبوو وتی خودا بۆ کارزانی یەك مۆڵەتی دایە، هەبو گاڵتەی پێ هـات و سـەری بۆ بادەدا!

بەهەرحاڵ لاوەکە بەدڵخۆشی وسنگ دەرپەڕیوی گەڕایەوە ماڵـەوە، وەك بڵێ ی بەبەڵگەی هزری سەڵماندویەتی، کە خوانیەو کەس بەرلەو گومانی بۆ ئەوەنە چووە، وە مرۆڤ بێ هودە دروسـت کـراوەو، خـوداو لێ پرسینەوەی نیە. چووە ماڵەوە دایکی خواردنی بۆ ئامادە کردبـوو،

دایکی شوێنی دانیشتنی سەرخوانی بۆ بەجێ هێشتبوو، لەوکاتەدا لاوەکە بەپەلە ڕادەکاتە ئاودەست و دەڕواتە ناوی و نایەتە دەرەوە، زۆر چاوەڕێ بوون نەهاتەوە، بۆیە دایکی چوو لەدەرگای پێشاوەکەی داو بانگی کرد کوڕەکەم بۆ دواکەوتی؟ وەڵامی نەبوو، ئەنجا باوکە بەپەلە چوو دەرگاکەی کردەوە، دیمەنێکی بینی قەت بەرچاوی نەکەوتبێ، بینینی وا کوڕەکەی لەتەك دەست شۆر کەوتووەو مردووە. نوژدار لەڕاپۆرتەکەیدا دەنوسێ: هۆی مردنی ئەوە بووە ئاو چووەتە ناو گوێچکەیەوە. ئایا ئەمە جێگای پەندوەرگرتن نیە!؟؟

**چیرۆکی هەژدەهەم:**

# ئاخاوتنێکی تەلەفۆنی شەیتانی

دەستی کرد بەگەمە کردن بەژمارەکانی موبایـل و تەلەفۆنەکـەی، لـەپڕ ژمارەیـەکی لێ دەدات، لەوکاتـەدا منـداڵێ قـسەی لەگـەڵ دا دەکات.

وەلامدەرەوە: (هەلەو... هەلەو...)

منداڵ: هەلەو چۆنی، تۆکێ ی؟

نەناسراو: تەمەنت چەندە؟

منداڵ: (٦) ساڵانەم.

نەناسراو: ماشاڵلا بە خوا پیاوی، کەست لەلایە؟

منداڵ: نەخێر، تۆکێ ی؟

نەناسراو: من مامی تۆم.

منداڵ: بەخۆشی یەوە: ئایا مامە (ئەللی) منی لە سعودییە؟

نەناسـراو: بەدەنگـەکی پـڕ لەخـەم: بـەڵێ مـن مـام ئـەللی تـۆم لەسعودییە، ئەی کوا خوشکەکانت؟

منداڵ: من خوشکم نییە!

نەناسراو: باشە ئەی کێ لەماڵەوە تانە؟

منداڵ: بەس خزمەتکارەکەمان.

نەناسراو: جوانە؟

منداڵ: نەخێر جوان نییە؟

نەناسراو: ئەی دایکت لەکوێیە؟

منداڵ: لەگەرماودا مەلە دەکات و خۆی دەشوات.

نەناسراو: باشە خودا حافیز، ئەنجا موبایلەکە دادەخات. دوای چەند خولەکێ موبایل دەکاتەوە:...

نەناسراو: هەلەو هەلەو...

منداڵ: چۆنی مامە؟

نەناسراو: کوا دایکت؟

منداڵ چووە تەژووری نوستن

نەناسراو: چی لەبەر دایە؟

منداڵ: کراسێکی جوان و سور، هەمووی ئاوە

نەناسراو: ئەڵلا، خوات لەگەڵ.

جارەکی تر موبایلەکە دادەخاتەوە... دوای چەند خولەکێ...

نەناسراو: هەلەو هەلەو....

ئەو جار باوکی منداڵەکە وەڵام دەداتەوە: ئەلۆو کێ لەگەڵمدایە؟

نەناسراو: بەقسەی گاڵتەوە: بەستەزمان پێ دەچێ تۆ ئێستا لە دەوام گەڕابیەوە؟

باوکی منداڵ: پێم بڵێ تۆکێ ی چیت دەوێ؟

نەناسراو: تووڕەمەبە، بەس ویستم ڕاشکاوانە پێت بڵێم تۆژنەکی جوانت هەیە، بەڕاستی بەستەزمان زانیوتە هەڵی بژێریت، دەمەوێ بڵێم بەر لەکەمێ من لەگەڵ ژنەکەتدا نوستبووم، تاخۆم داوام لێ کرد جلی سور بپۆشێ، ئینجا موبایلەکەی داخستەوە.

باوکی منداڵ: ئەی لەوبێ ئابڕوو بێ شەرمە. موبایلەکە فڕێ دەدات دەڕواتە قاتی سەرەوەو دەچێتە ژوری نوستنەوە، دەبینێ ژنەکە بەرگەکی سوری کردۆتە بەرو قژی تەڕەو لەبەر دەم توالیت دانیشتووە خۆی جوان بکات، ئەویش لەدەستی دەفڕێنێ و سەری بەئاوێنەکەدا دەکێشێت، پاشان دەیداتە بەر شەق ولێدانەك گشت گیانی دەشکێنێت و، پێ ی دەڵێ داوێن پیس لەماڵی من بڕۆدەرەوە، تۆ لەبنەماڵەیەکی بەڕێزنیت...

هەرچی ژنەکەیە بەستەزمانە ئاگای لەهیچ نییەو هیچ لەخۆیدا شك نابات، بۆیە زۆربە حەپەساوی یەوە لەمێردەکەی دەڕوانێ، نازانێ چی پێ بڵێ و چی وەڵام بداتەوە...

بۆیە بەپەلە کەل و پەلی خۆی هەمووی کۆدەکاتەوە تابۆ ماڵی

باوکی بچێتەوە.

باوکی منداڵەکە بەسەراسامیو تورەییەوە دادەنیشێ، نازانێ چی بکات، چی لێ قەوماوە، نازانێ چی بکات و سکالاّ بۆ کوێ بەرێت.

بەهەرحاڵ دوو ڕۆژ پشوی نەداو چاوی لەسەر یەکتری دانەنان...

بەلاّم لادەرەکە خودا پشت گوێ ی نەخست، خەوی نەما و هەمیشە بێدار بوو بەچەند کاتژمێر لەسەر جێگا ڕادەما، سەرەدەمانێك ئاوا مایەوە تا وای لێ هات لەڕو لاواز بوو، ڕەنگی زەردبوو، دنیای لێ وەتەنگ هات،دەیویست گەر بۆ چەند ساتێ بێ بخەوێ، بەلاّم نەیدەتوانی، بەدرێژایی شەو بیری لەوژنە بێ تاوانە دەکردەوە، کەبە موبایلەکی شەیتانی لەگەڵ مێردوماڵی دا لێکی دابڕین.

ئەوەی گرنگ بێ پرسی بەپیاو چاکێ کردو بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە.

پیاوچاکەکە وتی: بەخودا چارت تەنیا ئەوەیە کەلای ژن و مێردەکە دان بە گوناهتدا بێنیت، شایەت لێت خۆش بن و پشوبدەی و بگەڕێیەوە دۆخی ئاساییت.

دژیار: من ئامادەم، ئەوەی گرنگە دەمەوێ بخەوم و دەمارەکانم تەقین.

پیاوچاکەکە: کەواتە بچۆ پەیوەندی بەباوکی منداڵەکەوە بکەو شوێنی دیداری لێ وەربگرە، من خۆم لەگەڵتدا دێم.

ئەوەبو چاویان بەیەکتری کەوت و پیاوەکە بەگەرمی پێشوازی لێ کردن.

پیاوچاکەکە زەمینەی بۆ قسەکان خۆشکردو باسی هەندێ لەو ئایەتە قورئانیانەی کرد، کە داوا دەکەن لەخەڵکی ببورن، ئەنجا پاداشتەکانی چاوپۆشی کردنی باس کرد. پاشان داوای لەو دژیارە کرد ڕاستو ڕەوان بۆ پیاوەکە قسەکە بکات و بەکوردی لەبنی کولەکەی بدات، ئەوەی لەبنی بەڕەدایە بیهێنێتە سەربەڕە.

ئەوە بوو دژیارەکە دەستی کرد بەقسە کردن و مێردەکەش گوێ ی بۆ شل کردبوو، دوای تەواوکردنی قسەکانی والابونی ڕاستییەکە بۆ ئەو مێردە، هەڵسا یەك تێ هەڵدانی چاکی لێ داو خوێنی لێ دەهاتە خوار، پیاوچاکەکەش ناوبژی دەکرد، ئەنجا دوای ئەوەی چاکی دارکاری کرد هێور بۆوە. پیاو چاکەکە وتی:

سوپاس بۆ خودا ڕاستییەکە ئاشکرا بوو، مرۆڤی لێ بوردە بەڕێزەو ژنەکەشت داوێن پاکە ولەشیری پاکترە، خوا لێت ڕازی بێ لێ ی ببورە.

مێردەکە: بەڵێ، لەبەرماندویان هانکە هانکی گرتبوو،

بەومەرجەی لەبەردەم ژنەکەمدا ئەم تاوانبارە دان بەتاوانی خۆی دابنێ، تا هەڵوێستی من تێ بگات و بێ تاوان ببم لەبەر دەمی داو بگەڕێتەوە.

دزیار: بەسەرچاو بەس من بخەوم.

ئەوە بوو چوینە ماڵی باوکی ژنەکەو لەوێ دانیشتین، براکانی ژنەکەش لەوێ دەبن، پاشان مێرد داوا لەژنەکە دەکات تاگوێ لەقسەکانی ئەو دزیارو پیاوچاکە بگرن، دوای ئەوەی دزیارەکە سەرگوشتەکەی گێڕایەوە، براکان هەموویان هەڵیان کوتایە سەرو تێرو پڕیان لێدا خەریك بوو ببورێتەوە، پیاوە چاکەکە هەڵسا چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی خوێندەوەو لەکۆڵی کردنەوە. ژنەکە لەوکاتەدا هەڵساو لێدانەکە نەماو چاوەڕێ ی ئەوەیان کرد چی دەڵێ!

وتی: یاشێخ سوپاس بۆ خوا ڕاستی یەکان ئاشکرا بوون.

بەڵام شیاونی یە بگەڕێمەوە لای مێردم، ناگەڕێمەوە لای پیاوێ لێم بدات و هەڕەشەی تەڵاقم لێ بکات تەنیا لەبەر چەند قسەیەکی گەوجانە، واتە: یاشێخ بڕوامان لەنێواندا نییەو، ناشتوانم لەگەڵ کەسێکدا بژیم متمانەی پێم نەبێ، ودڵی لێم پیس بێ پاشان دانیشتنی ئەوانی بەجێ هێشت، بۆ براکانیشی دوپات کردەوە، ئەوە دوا وەڵامی منە.

منیش وتم: خوا ڕاستی فەرمووە:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ﴾. ﴿الحجرات/٦﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە گەر فاسقێ هەواڵەکی هێنا ڕونی بکەنەوە، نەوەکا هەندێکیان بە هۆی نەزانی توشی بەلایەك بىن و، پاشان بەهۆی کردنی ئەو کارە پەشیمان ببنەوە.



چیرۆکی نۆزدەهەم:

## سەرشۆڕی و ئابڕو چوون

ئەو ئافرەتە لەڕاست خۆیڕا دەڵێ: من لەقوتابخانە ڕام کرد، چونکە ژوانم لەگەڵ گەنجێکدا دیاری کردبوو، ڕام کرد نەم دەزانی چی چاوەڕوانیم دەکات.

لاوەکە هات و لەگەڵیدا سواری ئۆتۆمبێل بووم، پێکەوە لەوپەڕی شادی دا کەوتینە ڕێگا، چونکە شەیتان ئەو وێنەیەی بۆ شیرین کردبووین... چەند خولەکێکی نەبرد ئەو خۆشییە گۆڕا بەشین، ڕوداوێکمان هاتە پێش و بەساغی بۆی دەرچووین، چەند خولەکێکی نەبرد پۆلیس گەیشتە ئەوێ، هاوڕێکەشم سەرقاڵی هۆکاری ڕودانی کارەساتەکە بوو، لەوە ترسا ئاشکرا ببێ چونکە من خوشك و خزمی ئەو نەبووم. بینیم پەیوەندی بە برادەرێکی خۆیەوە کرد، کە ئەویش هاوڕێ ی ڕابواردن و داوێن پیسی ئەو بوو، پێی وت: وەرە بۆ شوێنی ڕوداوەکە ئەم کچە بۆ شوقە ببە- کە شوێنی داوێن پیسی یە، چونکە من سەرقاڵی ڕوداوەکەم.

چەند خولەکێکی برد گەنجەکە هاتە ئەوێ، منیش لەکاتی

دەرچووندا پەچەکەم داناو لەگەڵ هاورێکەی دا چوومە ناو ئۆتۆمبێلەوە، کە سەیرم کرد ئەوەی بینیم تۆقاندمی، چونکە ئەو برادەرەی برادەرەکەم پەیوەندی پێوە کردبوو برای حەقی خۆم بوو، بەم دیمەنە واقم وڕماو قەت چاوڕێ ی ئەوەم نەدەکرد (تەواو).

شافیعی ڕاستی وتووە: (عفوا تعفوا نساءكم في المحرم وتجنبوا مالايليق بمسلم).

واتە: داوێن پاك بن ژنانی ئێوە داوێن پاك دەبن، خۆتان لەو گوناهانە بپارێزن کە شایانی بە موسڵمان نییە[٣].

---

([3]) بێگومان کاتێ (ئوقیانوسێك لەتاوان)ی (خەندان محمد جەزا) دەخوێنیەوە تێگەی زۆربەی گوناهەکانی لەش فرۆشیو داوێن پیسی بۆ بنەماڵەی خراپو مێژدی داوێن پیسو برای داوێن پیسو برا دەری داوێن پیس دەگەڕێتەوە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (عفوا عن نساء الناس تعفوا نساءكم).

**چیرۆکی بیستەهەم:**

# بەکام تاوانە کوژرا ؟!

ئەم چیرۆکە نەقیب (سامی بن خالد الحمود) ئەندامی بەڕێوەبردنی کاروباری ئاسایشی قەڵاچوو کردنی هۆشبەرەکاندا لە ئاسایشی گشتی و لەڕابردوودا دەگێڕێتەوە:

جیهانی هۆشبەرەکان (المخدارات) جیهانەکی سەیرو پڕ لە ڕوداوو هەڵوێستی کاریگەرە، کە زمان و خامە لەوەسفی دا دەستەوەستانن و لاڵن.

ئەمە لاپەڕەیەکە لەلاپەڕەکانی جیهان، بەسەردانی تراژیدیاو کلۆڵی یەك دەگێڕێتەوە، کە خێزانێکی بێ تاوان بەهۆی باوکێکی ستەمکار گرفتار دەبێ، کە دڵی هۆگری بازرگانی بەمادده هۆشبەرەکانی کردبوو، گوێی لەڕاست ئاهی کچ و کوڕەکانی کەڕ کردووە.

ڕۆژێکیان لەکاتی کارکردنمدا لە یەکێ لە بەڕێوەبردنەکانی نەهێشتنی مادده هۆشبەرەکاندا، ئەرکی دەست گیرکردن و کەسێکم پێ سپێردرا کە بازرگانی پێوە دەکرد، کە مرۆڤە نەگریسەکانی بیانی هەڵیان دەسوڕاندو کردبوویان بەچەکوچ بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە پاکەی پێ

بڕوخێنین.

شریتی ڕووداوەکانی دۆزەکە بەخێرایی گوزەری دەکرد، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە ئامادەکاریەکان سازکران، پاشان کاتژمێری سفر بۆ ئەنجامدانی ڕۆڵەکە دیاری کرا، سوپاس بۆ خوای گەورە ئەو پیاوە دەست بەسەر کراو هەندێ حەبی هۆشبەریشی پێ بوو.

زنجیرەی ڕووداوەکان نەبڕایەوە، بەڵکو چەند ساتەکی تێدامایەوە هەرگیز لەیاد ناچنەوە.

ئەو پیاوە شوێنێکی لێ ئاشکرابوو، بۆ شاردنەوەی ماددە هۆشبەرەکانی دەست نیشان کردبوو، کەبرەو و ڕەواجی پێ دەدا، ئەم هەڵوێستەیە پێویستی دەکات بڕی ئەو ڕێژەیە بزانرێ، بەپێی ئەو جێبەجێ کردنە ئاسایشی یە بۆ پاراستنی کۆمەڵگا لە مەترسی یەکانی ئەو ژەهرە کوشندەیە.

تیپەکە لەگەڵ تاوانباردا دەچنە ماڵەکەوە، لەو کاتەدا هەموویان لەبەردەم دەرگادا دەوەستن، بێ دەنگی هەموو لایەکی گرتبۆوە، وەك بڵێ ی هێوریەکە پێش گەردەلولەکە کەوتبێ، تاوانبارەکە دەڕواتە بەردەرگاو لێ ی دەدات، لەوکاتەدا دەنگی خۆشی لەپشت دەرگاوە دێ ودەم ولێوی ئەو خونچە بێ تاوانەنە پڕ دەکات: هەی باوکمان هاتەوە، هەی باوکمان هاتەوە، کچە بچکۆڵەیەکیان بەهەموو سۆزو

ئەوینێکەوە گەمەو شۆخی لەگەڵ باوکی دا دەکات: باوکە دەرگات لێ ناکەمەوە، هێشتا بەستەزمانە نەیدەزانی لەدوای ئەم دەرگایەوە چ باس و خوارسێ هەیە.

بەلام دیمەنەکە لەدەرەوە ئازارو خەم دەخاتە سەر ڕوی ئامادەبوانەوەو بەچاوی ئاخ و کەسەرەوە لەیەکتری دەڕوانن.

بەلام هەندێکی تر ڕاست و چەپ چاویان دەگێڕا، تا لەدوایی دا لەبەر توندی ئەو هەڵوێستەیە لەسەر سنگیان وەستا، زۆری نەبرد منداڵەکان دەرگایان کردەوە، وایان دەزانی ئەو باوکە خۆشەویستە یاریو بووکە شووشە یان شیرینی، یان بزەیەکی بۆ هەڵگرتبن، بەلام لەهێکرا دەبینن تاوانبارێکە پیاوانی ئاسایش دەوریان داوە، ئەو سەدایانە گورج بۆچەند ئاهێ گۆڕان و شاییان لێ بوو بەشین و، ئاواتەکانیان بوون بە ئازار، گەر دەتبینی چۆن یەکێکیان دەچۆوە باوەشی باوکییەوەو ئەو یتریان خۆی بەجلەکانی دا هەڵواسی بوو، یەکێکی تریشیان تازە تۆغیانی بوو سەرەنجی دەداو نەیدزانی مەسەلە کە چییە.

گەر تۆ چاوت بەم دیمەنە کەوتبایە خۆت بۆ ڕا نەدەگیراو زۆر دەگریاو ئاگری لەدڵت بەردەدا.

دوای ئەوە پیاوانی ئاسایش ئەرکەکی تریان ئەنجامداو دیمەنێکی تری کڵۆڵی و تراژیدیا دەرکەوت، وێنەیەکی کاڵی ماڵێکی هەژارو

کەساس دەخاتە ڕوو، کەڕوی ماڵەکەی داگرتبوو. دەچنە ناو ژووری نوستنەوە تەنیا کەل و پەلی کۆنە شکاوو وڕایەخ و پەرتو بڵاوی لێرولەویّ ی لێیە، ژوری نان خواردنیش زبڵدانەکی پیسیەکانەو، ئازوقەو ڕۆزیشیان پاشماوەی دانەوێڵەو چەند قتووەمەنی (المعلبات)یەکە، کە مرۆڤ پیّ ی تێرنا خوات و ئاگای سکی ناکات.

ژیانەکی کلۆڵ و کۆلەمەرگییە، کەچی باوك لەبیّ ئاگاییدا ڕوو چوودو ماڵی پشت گوێیان خستووە.

لەکۆتایی دا هەندیّ کەرەستەی هۆشبەر لەماڵەکەی دا دۆزرایەوە.

پەردەی شانۆکە بە چۆل کردنی ماڵەکە دادرایەوە، لەناوەندێکی پڕ لەگریان و بابەڕۆی بیّ تاوانەکان دا، کەلەبەر دەرگاکە وەستا بوون، خودا حافیزییان لەکەسێك دەکرد، لەماڵی ئەودا گەورە بوون و بۆ باوەشی ئەو ڕایان کردووە، بەباوکە ناسراوە.

لەو دیمەنە پڕ لەگریانەو ئازارە داخم لەو تاوانبارە هەڵساو پیێم وت: لەخوا ناترسی، ئایا بیرت لەو چارەنوسە نەدەکردەوە؟ باوك ئاوا جگەر گۆشەکانی بەخێو دەکات؟ تاوانی ئەو بیّ گوناهانە لەڕاست ئەودا چی یە؟ بۆ دەبیّ ئەو ئازارە هەڵبگرن؟ ڕوبەڕو چومەپێشی و لێم پرسی تا وەلامم بداتەوە!

بەلام تەنیابە قوڵپەی گریاو ئەوەندەی وەلامدایەوە: من هۆکاری ئەوەبووم.....

چیرۆکی بیست ویەك:

# ئەی مێردەکەم سەرت تیا چواندین

ئافرەتێکی خەفەتبارەو لەبەر ناسۆرەو خەمەکانی ڕۆژگار سەری سپی بووەو لەبەر ئازار و ئەشکەنجەکان دەم و چاوی وەکو کەساسێ بەدیار دەکەوێ، تراژیدیاکانی خۆی لەگەڵ مێردی مودمین و خوگری بە سەرخۆشکەرەکانەوە دەگێڕێتەوە و گریان و قسەی پڕلەخەمی ئاوێزانی یەکتری دەبن... گەر خۆشم لەسەر ئەم داستانە هەڵویستەم نەکردبایەو لەگەواهیدرەکە قسەکەم هەڵنەگرتبایەوە، ڕەنگە بەخەیاڵێك، یان بەزیادڕەوییەك سەیرم کردبایە، دەڵێ:

مێردم لەکۆمپانیایەکی بەرزدا کاری دەکرد، منی خۆشدەویست و نازی دەکێشام و سۆزو بەزەیی لەگەڵ من و منداڵەکانمی دا دەنواند، وام دەزانی بەختەوەرترین خێزانم لەجیهاندا. دوای ماوەیەك ئەم خۆشیە بە پەلە بەرەو دۆزەخ دەگۆڕا، بەگۆڕانی کت وپڕی مێردەکەم، ڕووداوە تاڵەکان دەستیان پێ کرد، باری دەرونیەکەی گۆڕا، میزاجی ئاوەژو بۆوەو، لەکەمترین شتدا توڕەدەبوو، جار هەبوو ئەوندە لێی دەدام دەم وچاومی دەئاوساند، کە دەهاتەوە ماڵەوە بۆنێکی ناخۆشی لێ دەهات. ڕۆژێکیان جل و بەرگەکانیم بردن بیانشۆم، پارچە



حەشیشەکی هۆشبەرم بەردەست کەوت. بەلایەکەم دۆزییەوە، زانیم مێردەکەم هۆگری ماددە هۆشبەرەکان بووە.

هەولّم دا ئامۆژگاری بکەم، بەلاّم هەموو جارێ بێ سود دەبوو. داوام لەباوانم کرد بێن ئامۆژگاری بکەن، بەلاّم خۆزگە هەرنەهاتبان، چونکە هەرکە سەری باسەکەیان کردەوە، جنێوی پێدان‌و لەماڵەوە دەری کردن.. حالّی مێردەکەم هەر خراپتر دەبوو، تاوای لیّ هات لەڕەفتارم بکەوێتە گومانەوە.

من ، لەبەر خاتری خێزان و منداڵەکانم لەبەرامبەر ئەو تۆمەتانەدا خۆم ڕادەگرت.

ڕەنگە باوەڕنەکەن تا لەڕەفتاری کچی (٧) ساڵەشم کەوتبۆ گومانەوە!!

جارێکیان لەدەرگای دا، کچە بەستەزمانەکە چوو دەرگا بکاتەوە، بەلاّم ئەو سەرخۆش بوو، ئەو کاتە وای دەزانی ئەو کچە منداڵە لەگەلّ پیاواندا دانیشتووە!!

چۆن نازانم! کەوتە لێدانی، لەبەر ئەوە ڕایکردو ئەویش شوێنی کەوت، تا خۆی لە ژووری مندا حەشاردا، دوای ئەوە چەند شوشە عەترێکی تیّ گرت، باسکی شکاند، منیش لە تاوان هاوارم کرد، پەیوەندیم بەبراکەمەوە کردو پێکەوە بۆ نەخۆشخانەمان برد، هەندیّ وردە شوشەی چوو بووە ناو هەردوو چاوە بیّ گوناهەکانیەوە. هەر

بەوەندەش نەگیرسایەوە، ڕۆژێکی تر وەکو هاریٚ کچە بچوکەکەی گرت‌و بەشەقامیداداو سەری شکاند، بەڵام خوا کردی خەسوم لەماڵ بوو پێکەوە گەیاندمانە نەخۆشخانە.

کاتیٚ مێردم ئەو ژەهرەی دەخوارد بۆ گیاندارەکی تر دەگۆڕا، دەبوو بە دڕەندەیەکی بیٚ بەزەیی و لاشەیەکی بیٚ هزر.

جارێکی تر هاتەوە سەرمان مەست بوبوو چای گەرمی گرتە کچە بچوکەکەم و سوتاندی، تا ئەو ڕادەیە هەڵوێستی ناشیرینی دەنواند. بەڵام بەلاّی گەورە بۆ کوڕە گەورەکەم بوو، کەئەو کاتە (١٢) ساڵانە بوو، ئەو کوڕە دوا هیوام بوو، تازە لە مێردم نائومێد بووبووم.

ئەو هیواکانی منی کوشتبوو هەموو واتا جوانەکانی ناودڵمی تێك شکاندبوو...

شەوێکیان مێردم لەگەڵ ئەو هاوڕێیە خراپانەیدا دانیشتبوو، لەئاکامی ئەو دانیشتنە شەیتانییە دەترسام، ئەوەی گرنگە منداڵەکانم بردە ژوورو قفڵم دا، دوای چەند کاتژمێرێك منداڵەکان نوستن و تەنیا خۆم مامەوە چاوم نەنایە سەریەك، چۆن لەوشەوە ترسناکەدا بخەوم، لەگەڵ مێردێکدا هەموو واتاکانی بەزەیی لەدەستداوە. شەوەزەنگ بوو لای کات سیٚ دەبوو، دەنگی دەرگا هات، مێردم هاواری دەکرد دەرگاکە بکەوە، منیش هاوارم کرد نایکەمەوە، لەوکاتەدا منداڵەکان بێداربونەوە، بەلاّم بیٚ سیٚ و دوو

دەرگاکەی شکاند، مێردەکەم هاتە ژوورەوەو پەلاماری من و منداڵەکانی دا، کەوتە لێدانیان تا جل و بەرگی بەرمی تیتوبە تیتو کرد، دەستی دایە گۆچان لەسەری کوڕەکەمی شکاند، دوایی وەکو شێتان ڕاست وچەپ ئاوەڕی دەدایەوە.

تەنیا تاوڵەکی بینی، بەرزی کردەوەو بەسەری کوڕە کەمیدادا، سەری شکاندو خۆێن وەکو جۆگەلە لەبەری دەڕۆیی، هاوارم کردە دراوسێکمان، بەڵام کەس فریام نەکەوت.

ڕام کرد بۆ بەفرگرەکە تا پارچە سەهۆڵێك بێنمە دەرو بیخەمە سەری کوڕەکەم تا خوێنی بوەستێ، بەڵام نەگیرسایەوە، بەپەلە بێ ئاگاو بێ پێڵاو وبێ پۆشتە ڕام کردە دەری لە ماڵ و لەدەرگای ماڵی دراوسێکەکانمدا، ڕوداوەکەم بۆ باس کردن، ئەوانیش هاتنە ماڵمانو منیش گەرامەوەو منیش چووم بینیان ڕۆڵەکەم لەخوێنی خۆیدا دەگەوزێ یەکسەر ڕەوانەی نەخۆشخانەمان کرد، لەوێ دا خرایە ژێر چاودێریەکی چڕو پڕەوە، تا (٣) هەفتە مایەوە. کارەساتەکە لەوەدا بوو کوڕەکەم بەو زەبرە مێشکی تێك چوو، دوای دوومانگ کوڕەکەم لە نەخۆشخانە دەرچوو، بووە بار بەسەری منەوە، نەك ببێتە یارمەتی دەرم و گرێیەکم لەبەرۆك بکاتەوە.

بڕوا بکەن خۆزگەم دەخواست بمردبووایە. ئەو خۆزگەشم لەمەڕ مێردەکەمەوە بوو، لەخوا پاڕامەوە ڕاپێچی بەندیخانەی بکەن، نزام



گیرا بوو، دوای هەفتەیەك ئاسایش گرتی، بۆ دوو ساڵ زیندانی کرا، بەڵام لەماڵەوە گرفتی ترم بۆ پەیدا بوو، منالەکان بەردەوام دەیانپرسی کوانێ باوکمان، بۆچی گیراوە؟ بۆ لەزیندانی دایە؟

زۆرم سەردان دەکرد، چەند ڕۆژێ دوای دوورکەوتنەوەی لە هاوڕێ بەدەکانی، زۆرگۆڕا بوو نوێژی دەکرد، زۆر باش بووبوو.

بەڵام جارەکی تر، کەچاوەڕێم نەدەکرد هاوڕێکانی ڕابردووی لێ ی کۆبونەوە، تا بۆ هۆگر بوون بەماددە هۆشبەرەکان ڕایکێشنەوە، جارەکی تر بەهۆی ئەو خووە باری داراییمان خراپ بۆوە، تا وای لێ هات کەل و پەلی ناو ماڵ و ژووری چێشت لێ نانمان هەمووی فرۆشت، ئەو هەموو داراییە بەشی چڵێسی خواردنی هۆشبەرەکانی ئەوی نەدەکرد.

ئەمجارە هەڵسا پارەیەکی زۆر زیاتری خەرج کرد، ئایا دەزانی پارەی چی بوو؟

کچە بچکۆلە (١١) ساڵەکەمی دایە پیاوەکی شێت و نەخۆش لەبەرامبەر مارەییەکی (٥٠٠٠٠) ڕایلی دا تا بۆ ئەو ژەهرەی خەرجی بکات.

دڵم بەشێوەیێ تەنگ بووە ناتوانم کارەکانی ماڵەکەم بکەم، تەنیا کاتێ دێتەوە لامان کەپارەی بەدەستەوە نامێنێ و، دێ ئەو پارەیەی خێرخوایان دەماندەنێ بەزۆری لەدەستمان دەردێنێ و پاشان دەڕوات.



بیرم لەڕۆژانی ڕابردووم دەکردەوە، خەریك بوو لەڕاست داخ وخەمان بمرم، بەڵام خۆشەویستان دوای ئەو تەمەنە درێژەش باوەڕم بەخودا قایمەو هیوام بەرنەداوەو لەخوانا ئومێدنەبووم، شەوو ڕۆژ لەخوام داوایە مێردم بۆ بگێڕێتەوەو منداڵەکانم چاك بکاتەوە، ڕۆژانی بەختەوەریم بۆ بگێڕێتەوە، کە خۆرو ئەستێرەکانی لێ ئاوابووەو، بەهیوای جارەکی تر بەرەبەیانەکی نوێم لێ دابێتەوە.



**بەسەرهاتی بیست ودوو:**

## سەرگوشتەکەم لەگەڵ کچۆڵەکەمدا

یەکێ لەو کەسانەی خودا پاکی دەکاتەوەو شیفای دەدات (ب.م)، کە خاوەن هاوسەرەو حەوت منداڵی لێ هەیە وتی: ژیانی هۆشبەرەکان سەرشۆڕی و ئابڕو چوونە، ئەو کەسەی هۆگری دەبێ هەموو شتێ قبوڵ دەکات و بۆ بەدەست هێنانی ئەو ماددانە بەهەموو شتێ ڕازی دەبێت. تا بەشوێن هاوڕێ خراپەکاندا سۆراغی تەواو دەکەیت بیاندۆزیەوە، چونکە ئەوان ڕێگات بۆ خۆش دەکەن لەکوێوە ئەو ژەهرانە بەدەست بێنیت.

بەڕاستی ئەوە ژیانەکی کەساس و کلۆڵە، سەرەتا سۆراغ کردن بوو، بەڵام ئیمڕۆ (٢٠) ساڵە لەناو ئەوەدا دەژیم و هەموو هۆیەکانی سەرشۆڕی و ڕیسواییم تێدا بەسەربرد، چونکە هۆگرێکی ترسناکم لێ دەرچووە.

سەرەتای ئەو ڕێگایە بۆ ئەو جیهانە تاریکە، هاوڕێیەکی خراپ بوو، کەپێی لەسەر ئەوە داگرت بەکاری بێنم، چونکە بەگوێرەی قسەکانی ئەو خۆشی وچالاکی بەخشی بەهەموو لەش دەدات!



منیش پەسەندم کردو، خۆزگە بەقسەم نەکردبایە، لەوکاتەدا ئاخی هەڵدەکێشا، وتی: پاشان نازانم چۆن ئەم ڕێگایەم گرتەبەر، چونکە پەیتا پەیتا ڕات دەکێشیێ، تا دەکەویە تۆڕەوە، کە خۆت ناتەوێ لێ ی دەربازببی، چۆن نا؟ ئێمە کەس ناوی خوامان نەدەبردوو، نوێژ کە کۆڵەگەی ئایینە هەر ئاشنایەتیمان لەگەڵی دانەبوو.

بەڵام لەڕاست ژن و منداڵمەوە، زۆرم لەژنەکەم و منداڵەکانم دەدا،هەر بەداواکارێکی کەم، گەرکەمیش بوایە دارکاریم دەکردن، سەرباری ئەوەش لەگەڵ ئەو ڕەقیەمدا ئەوان دەهاتنە باوەشم. بەڵام من گوێم پێیان نەدەدا، هۆیەکەش ماددە هۆشبەرەکان بوو.

لەیادمە جارێکیان لەماڵەوە دانیشتبووم کچە بچکۆلانەکەم، کەشەش ساڵانە بوو، بێ تاوانی بەدەم و چاویەوە دیار بوو ڕوی سپی بوو بەمنی وت:

باوکە بۆ کەم دەتبینین؟ بۆچی لەگەڵماندا پێناکەنی؟ بۆچی یاری منداڵان و حەچچە حەچچێ لەگەڵمدا ناکەی سواری پشتت بم..؟ هتد.

بەڵام من خامۆش بووم ئەو سۆزە پەپولەییەی ئەوم گوێ پێ نەدا، چونکە لەکاتی سەرخۆشیدا هەستم بەسۆز نەدەکرد، دوای ئەوەی لەگەڵمدا لەگەمەکردندا بوو پێی وتم: باوکە وەکو هاوڕێکانم لەخوێندنگادا یاری منداڵانم بۆ بکرە، لەوکاتەدا کە شەو بوو دنیام

لێ وەتەنگ هات، هەڵسام لێدانەکی وام لێ دا، لەشم شکاندو، ئینجا دەستم گرت کردمە دەرەوەو، بەرەڵای جادەم کردو، دەرگام لێ داخست، بیستم هاواری دەکرد باوکە تۆبە جارێکی تر داوای شت ناکەمەوە، دوای ئەوەی دایکی هاتە ناو مەسەلەکەوە، دەرگام لێ ی کردەوە. ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان وتی: بیربکەوە لەکچی خۆم دەدەم و بەهۆی یاریەکەوە ئاوارەی شەقامەکانی دەکەم!! ئەمە ماددە هۆشبەرەکانە، ئەمەشی بەدەنگەکی بەرز وتەوە شایەد ئەو وشانە بەگوێ ی هەموو هۆگرێك بگات و لەحەقیقەتی خۆی سەر دەربکات ، پاشان وتی: زۆربەی ژیانی خۆم لەسەرشۆڕی دابەسەر برد، من تەنیا لەماڵ و پول دەگەڕام، تا ئەو خراپە کاری وتێك دانەی پێ بکرم.

ڕۆژێکیان پیاوێکی گەڕەکەکەمان لەکاتی ڕۆشتنمدا بەسەر شەقامدا ئۆتۆمبێلەکەی لەپێش مندا ڕاگرت، ئەو کاتەش لەبەر خەمباری چوو بوومە دەرەوە، زۆر بەگەرمی سەلامی لێ کردم وپێ ی وتم: دەمەوێ لەبارەی مەسەلەیەکی تایبەتییەوە قسەت لەگەڵدا بکەم، دوای سووربوونی زۆر، لەگەڵیدا سواری ئۆتۆمبێلەکەی بووم، خولەکی بەناو شەقامەکانی شاردا پێ کردم، خوا سەربەرزی بکات، خوای خستمەوە یاد ووتی: نابینم بێیە مزگەوت بۆ نوێژ، تاکەی لەوبارو دۆخەدا دەمێنیەوە؟ خوا ویستی ڕێنومام بکات، قسەکانی

ئەو بەر لە هزرم چوونە ناو دڵمەوە، سەرباری ئەوەش لەشێوازی قسەکردنی دا لەگەڵمداو کارزان ولێزان بوو چۆنیەتی کارتێ کردن وڕاکێشانمدا، خوا پاداشتی چاکی بداتەوە.

دوای تەواو کردنی گفتوگۆیەکەی پێکەوەرێك کەوتین، کەبمباتە مەڵبەندی گونجاندنی دەرونی (مرکز التأهيل النفسي)، کە بەویستی خوا دەبێتە هۆی چاك بونەوەم وڕێنومام، لەو خراپەکاری و ماڵ وێرانکەرە. هیواکەم دەست خەرۆ نەبوو، سوپاس بۆ خوا چاك بومەوە، ئێستا زۆر سەر بلندم و زۆر لەگەڵ خێزانمدا باشم، تا ئەو کچە بچوکەی لێم دا بوو مژدەبێ لەجیاتی یەك یاری منداڵانە دودانەم بۆ کڕیوە. لەوکاتەشدا پێ دەکەنی!

**چیرۆکی بیست و سێ:**

## مردو کورنۆشێکی بۆ خودا نەبرد

بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەیە، لەگەڵ شێخ (ابراهیم عبدالعزیز)دا ڕویداوە (تۆڕی ئەهلی سوننەو جەماعە):

دەڵێ: کەسێك پێی وتم: ئەی شێخ ئەو پیرەمێردەت بینیوە؟

شێخ: بەڵێ چییەتی؟

وتی: ئەو نوێژ ناکات.

شێخ: (سبحان الله)! چی دەڵێی نوێژ ناکات؟

بەڵێ نوێژ ناکات.

شێخ: دڵنیایت؟

بەڵێ: دڵنیام.

شێخ: بەو تەمەنەوە نوێژ ناکات!!

گەنجەکە وتی: یاشێخ بڕۆ لای بیدوێنە شایەد ڕازی بکەیت نوێژ بکات.

شێخ: بەڵێ کوڕم ئەمە ئەرکی منە. ئەوە بوو ڕوم لەپیرەمێردەکە کرد

ووتم: (السلام علیکم).

پیرەمێرد: (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته).

شێخ: بارو دۆخت چۆنە؟

پیرەمێرد: باشە سوپاس بۆ خودا.

شێخ: ئایا ئەوە ڕاستە کەوتومانە؟

پیرەمێرد: چییان لەڕاست مندا وتووە؟

شێخ: دەوترێ تۆ نوێژ ناکەیت.

پیرەمێرد: بەڕاستی منت تۆ قاندو زراوت بردم، وتم دەبێ چی قەومابێ، ئایا ئەمە لەڕاست مندا دەوترێت؟

شێخ: بەڵێ.

پیرەمێرد: ڕاستە من نوێژ ناکەم.

شێخ: تۆ لەوتەمەنەدا؟

پیرەمێرد: ڕاستە من نوێژ ناکەم، بەڵام دڵم پڕە لەباوەڕ، سوپاس بۆ خودا من باوەڕدارم، داوا کارم لەخوا ڕێنومایم بکات بۆ نوێژ کردن.

شێخ: کە دەڵێی دڵم پڕ لەبڕوایە ڕاست نییە، گەر دڵت لێوان لێوانی باوەڕبوایە ئەندامەکانت باش دەبوون، ئەوە ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) پێمان دەفەرمێ: (لەلەشدا پارچە گۆشتێ هەیە گەرباش بوو هەموو لەشت باش دەبێ، گەر خراپ بوو هەموو لەشت خراپ دەبێ، ئەمەش دڵە).

بەڵام تۆ بەهۆی کزی بڕوات نوێژ ناکەیت، بەوشتە ناڕاستانە خۆت

فریوداوە، تاکاتت بەدەستەوە ماوە تەوبە بکە.

پیرەمێرد: باشە گەر نوێژ نەکەم چی دەبێ؟ من باوەڕم هەیە، خودا پەیمانی بەباوەڕداران داوە، کە دەچنە بەهەشتەوە، گەر گوناهی زلیشیان هەبێ، ئەی بۆچی لەڕەحمەتی فراوانی خوا، کە هەمووشتێکی گرتۆتەوە نائومێدم دەکەیت؟

شێخ: من نامەوێ لە ڕەحمەتی خوا نائومێدت بکەم، بەڵام نامەوێ لەو کەسانەش بی، کە لەپلان و تاکتیکی خودا (مکرالله) بێ باکن و زەرەر بکەیت.

بزانە نوێژ کۆڵەکەی دینە، کێ ئەنجامی دا ئەوە کۆڵەکەی دینی ڕاگرتووە، کێ ڕوخاندی ئەوە کۆڵەکەی دینی ڕوخاندووە، بە نوێژ ئەهلی باوەڕو ئەهلی بێ باوەڕی جیا دەکرێتەوە، خودا لەڕاست دۆزەخیەکان فەرموویەتی ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴾. ﴿المدثر/ ٤٢-٤٣﴾. واتە: چێ ئێوەی خستە دۆزەخەوە؟ وتیان: کەسانێ نوێژکەر نەبووین.

﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾. ﴿مريم/ ٥٩﴾. واتە: وەچە بەدوای وەچە داهاتن نوێژیان چواندو شوێن هەواو ئارەزووکان کەوتن، داهاتوو دەچنە ناو دۆزەخەوە.

دوای ئەوەی ئەی چۆن نوێژ ناکەیت وتۆبە ناکەیت؟

پیرەمێرد: من دەمەوێ نوێژ بکەم بەڵام...

شێخ: قسەکانی پێ دەبڕێ و دەڵێ: بەبێ بەڵام، ئەی پیرەمێرد، تۆ گرنتی تەمەنی خۆت بەدەست نییە، تەمەن بەدەست خودایە،گشت کەسێ چارەنوسی بۆ مردنە. ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾!

چۆن پێ لەسەر دنیادا دەگری و پەسڵان بەرکەنار دەکەیت، چاکیش دەزانی دنیا چۆن دنیا زیندانی باوەڕدارە، بەهەشتی بێ باوەڕە!

تۆ لەتەمەنێکدایت لەپەسڵاندا پاساوت نەماوە، با لەپەسڵاندا لەناخۆشی‌و دۆڕاوان نەبیت.

پیرەمێرد: باشە، گوێم بۆ گرتی و حاڵی بووم، تۆ ئەرکی خۆت بەجێ گەیاند، ئێستا لێم بگەڕێ، پاشان ڕۆیشت.

شێخ: ئامۆژگاریم کردیت و،تۆش ئارەزوی خۆتە.

شێخ: دوای دووڕۆژ دەنگێ هات بانگی کردم: یاشێخ... یاشێخ..

شێخ ئاوڕ دەداتەوە، ئەوە ئەو گەنجەیە هەواڵی پیرەمێرد دەکەی پێ ڕاگەیاندووە، دەڕواتە پێشی و سەلامی لێ دەکات و دەڵێ: ئایا ئەو پیرەمێردەت لەیادماوە پێرێ قسەت لەگەڵدا کرد.

شێخ: بەڵێ چاکم لەیادماوە.

گەنج: مردووە.

شێخ: مرد، دڵنیایت؟ گەنج: بەڵێ بەیانی دوێنێ مردووە.

شێخ: (سبحان الله)! چۆن مرد؟

گـەنج: سـەر لەبـەیانی چـووە سـەر زەوییەکـەی و پارچـەکەی بەدەستەوە بووە، ئەوکاتە بەسەر سـەریدا کـەوت وڕێـك مـرد، بـەڵام یاشێخ شتی سەیرم لێ بینوە.

شێخ: چیت بەرچاوکەوتووە؟

گەنج: بینیم لـە زەوی خۆیـدا خـامۆش کـەوتووە دوور لـەڕێگای سەرەکی، داوای ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنم کـرد، تابیگوازێتـەوە، بـەڵام ئۆتۆمبێلەکە بەهۆی کەندو کۆسپی ڕێگا دوا کەوت.

لەوەش سەیرتر برێکی (فرملة) ئۆتۆمبێلەکە تێك دەچێ و خـەڵکی پێویستییان بەئۆتۆمبیلێکی تر دەبێ بۆ گواستنەوە.

شێخ: خودایە ئەی چی تر ڕویدا؟

تەرمەکە زۆر خۆر لێی دابوو، هیچ درەختێکی لێ نەبوو سـێبەری لێ بکات، بۆیە تەرمەکە هەڵاوسا بـوو، وێنـەکی ترسـناکی دروسـت کردبوو.

دوای ماوەیەك ئۆتۆمبیلێکی ترهات بردی، بەڵام لەڕێگادا...

شێخ: چی ڕویدا؟

گەنج: مەکینەی ئۆتۆمبێلەکە پەکی کەوت.

شێخ: بەڕاستی ئەوە ڕوداوەکی گەورەیە، ئەی چی تر؟

گەنج: ئۆتۆمبیلێکی ترهات، تەرمە کە تاکاتی نیوەڕۆ نەگەیـشتە شۆرگەی مردوان. دوای ئەوە کـە شوشـتراو برایـە گۆڕسـتان شـتێکی

سەیرتر قەوما؟

شێخ: چی تر؟ گەنج: بینیان کونی گۆڕکە تەنگە، چونکە لاشەکە زۆر هەڵاوسا بوو.

گەڕان بەشوێن گۆڕی تردا، بەڵام نەیان دۆزییەوە، تەنیا دوای نوێژی شێوان نەبێ. سەیرکە قوربان چی بەسەر پیرەمێردەکە دا هات؟

شێخ: (سبحانە اللە) گەر ئەمەی زانیبایە تا دەمردو بەخوا دەگەیشتەوە تەرك نوێژ نەدەبوو، بەڵام هیوا بێ ئاگایی دروست دەکات و مرۆڤ تەنیا بیر لەژیانی کەمی دنیا دەکاتەوە.



**چیرۆکی بیست و چوار:**

# ئەو کچۆڵەیە
# ویستی خاڵی ڕزگار بکات خۆی مرد

خوێن لەدەمی ئەو کچە بچوکەیە دەڕژا، کەتەمەنی لـەپێنج سـاڵ پتر تـێ پـەڕی نـەدەکرد، کـاتێ ئۆتـۆمبێلی فریاکـەوتن (الاسـعاف) گەیـشتە ئـەو دەڤـەرە تـا بـۆ نـزیکترین مەڵبەنـدی تەندروسـتی بیگوازێتەوە، چونکە لەبارێکی مەترسی دا بـوو، دوای گواسـتنەوەی بەپەلە برایە ژوری نەشتەرگەری، سێ کاری نەشتەرگەری گـورجی بـۆ کرا، تا لەخوێن پژان (النزیـف)ی دەرەکـی و نـاوەوە ڕزگـاری بکـەن، کەبەو هۆیە خوێن لە بەردەمی دەڕۆیشت، بەڵام هەموو هەوڵەکان بێ سوود بوون، پزیشکەکان نەیانتوانی گیانی لەمردن ڕزگار بکەن.

پزیـشکەکان هـەر سـەرەتای هێنـانی منداڵەکـە بـۆ نەخۆشـخانە زانییان ئەم ڕووداوە سەرەداوێکی تاوانی تێدایە، بۆیە بەڕێوەبەرایـەتی گشتی لێکۆڵینەوەی تاوانیان ئاگادار کردەوە، بریکاری جێگری گشتی لەوێ ئامـادەبوو، سـەیری ڕاپـۆرتی پزیـشکی شـەرعی کـرد، بینـی منداڵەکە دەرزییەکی پیسی خوێناوی قوت داوە، شوێنەواری ماددەی

هێرۆیین بەملی منداڵەکەوە دیارە، هەرکە باوك زانی کچەکەی لەنەخۆشخانە مردووە، تێك چوو، شێتانە چووە سەربانی خۆی هەڵدایە خوارەوە قاچەکانی شکان، دیسانەوە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن هاتەوە، باوکەکە بباتە نەخۆشخانە، کەباری تەندروستی شەپرێوو خراپە.

پاشان خرایە بەرچاودێرییەکی توندەوە، هەرچی دایکەکەی بوو، زۆر بەدژواری دەڕۆیشت و زۆر خەمبار بوو، لێکۆڵینەوە هەندێکی پێ چوو، لەوێ پرسیارەکە ئەوە بوو، کە سەریان سوڕما بوو: ئەو منداڵە بەچی مردووە؟ چۆن ئەو دەرزییە پیسە گەیشتۆتە دەمی منداڵەکە؟

ئەفسەری لێکۆڵینەوە بانگی دایکی منداڵەکەی کردو هەندێ لەخەمەکانی ڕەواندەوە، ئەو لەنێوان دوبەرداش دابوو، مردنی کچەکەی و باری خراپی مێردەکەی، کەلە ژێرچاودێرییەکی توند دایە، ئەفسەرەکە ماوەیێ وەستا، پاشان وتی: کچەکەی تۆ بەمردنەکی ئاسایی نەمردووە، بەڵکو بەنیمچە تاوانێ مردووە، بۆیە دەبێ هۆکاری ڕاستەقینەی مردنی ئەو کچەیەت بزانرێ.

ئەفسەرەکە لێ ی پرسی چۆن ئەو دەرزییە گەیشتە دەمی منداڵەکە؟ لەکوێ کەوتۆتە بەردەستانی؟ ئەو ئەفسەرە بەشوێن وەلامی ڕاستدا دەگەڕا، هەرچی دایك خۆی لەگێلی ئەدا.

لەکاتی ئاخاوتنی ئەفسەرەکە لەگەڵ دایکەکەدا پیاوانی لێکۆڵینەوە هاتنە ژوورو پێیان ڕاگەیاند، کە باوکی کچەکە لە نەخۆشخانە بەدوشەقەوە ڕایکردووەو ڕۆیشتووە وباری تەندروستیشی خراپە، کاتێ دایکەکە ئەو هەواڵەی بیست هاواری کرد: دەچێ دەیکوژێت.

کاتێ ئەفسەرەکە لە مەبەستی قسەکەی پرسیار کرد چی دەڵێی؟ وتی: لەداهاتوو هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، ئێستا خۆتان بگەێنە مێردم تا نەچووە براکەمی نەکوشتووە. لەوکاتەدا پیاوانی لێکۆڵەر ڕایان کردو چوونە ئەو جێگایەی برایەکەی ئەوی لێ بوو، کاتی گەیشتنە بەردەرگایماڵیان پیرەژنێ هاوار دەکات و جلەکانی بەری دەدڕێنێ: بیگرن ئەو ڕادەکات، نەکەن بهێڵن دەربچێت. کاتێ لێیان پرسی چی لەم بارەوە دەزانێ، وتی من ئاگام لەهەموو ڕوداوەکەیە. بۆیە لێکۆڵەر بانگی کرد بۆ نوسینگەی خۆی ودایکی منداڵەکەشی لەگەڵدا بوو، ئەو پیرەژنە کەنەنکی منداڵەکەیە دانیشت و پەردەی لەسەر ڕوداوەکە هەڵماڵیو وتی: ئەو منداڵە قوربانی دەستی کەسێکی هیچ و نابوتە، کەمانای منداڵەتی نازانێ، ئەوە کوڕیەتی، ئەو لە ڕۆژی ڕوداوەکە ئامادەبووە، ئەو لەترسی ڕاودونانی لێکۆڵەر خۆی لەژوورەکی سەرباندا حەشاردا بوو، دوای ماوەیەك دابەزی و

چووە ئەو جێگایــەی ئــەو منداڵــە گەمــەی تــێ دا دەكــرد، كەكـچی خوشكی ئەوە، دانیشتبوو تا سـرنجێكی هیرۆیــین لــە باسـكی بـدات، دەرزییەك دەچێتە نـاو باسـكییەوە، ئـەویش بـانگی كـچە خوشـكی دەكات داوای لێ دەكات بە ددانەكانی باسكی بگەزێ تا دەرزییەكەی لێ بێتــە دەرەوە. كــاتێ بــەوكارە هەڵدەســتێ دەرزی دەڕواتــە نــاو دەمیەوە، هەوڵ دەدا دەرزییەكە لەناو دەمی دەربێنێ، بـەڵام نـاتوانێ چونكە دەچێتە ناو قوڕگی یەوە، بەمە نەزیف دەبێ، كاتێ ئەو كچەی من دەبینێ خوێن لەدەمی كچە بچوكەكەیەوە دێتەدەر، هاوار دەكات و دەترسێ و لەماڵ ڕادەكات .

لێرەدا هێزێك لەئەفسەرانی لێكۆڵینەوە ڕوو لــەماڵی خـاڵی كــچە دەكەن، كە بۆتە هۆی مردنی كچەكە، لەوێ هەندێ لەو كەل و پەلانــە دەدۆزنەوە، كە بۆ هیرۆیین بەكار دەبـرێن، لەگـەڵ چـەند لاپەڕەیـەك، ئەفسەرێ دەبینێ دوجـار ژمـارەی تەلـەفۆنی نـاوێكی بـەناوی (ابــو احمد)ی لەسەر نوسراوە. لاپەڕەیەكی بچوكیشی لێیە بۆ بـەكارهێنانی حەشیش بەكار دێ.

دوای گەڕان وپـشكنین خاڵیــان لەســەربەلەمێك لــەدەریای كەنـداو گــرت، پیــاوانی ئاســایش هــەڵیان كوتایەســەر ئــەو كەشــتییەی گەشتوگوزارە (الیخت) خاڵەكەی لەوێ دا خــەوتبوو، بـرێ هیرۆیـین و

کەل و پەلی خواردنی و هەندێ دەرزی لەلا بوون، ئـەو گەنجەیـە گـیرا کەبە بەکارهێنانی مادده سەرخۆشـکەرەکان تاوانبـار کرابـوو، کـچی خوشکی خۆی کوشتبوو، بۆ لێکۆڵینـەوە بـرا گەنجەکـە دەسـتی بـە گریان کرد من مەبەستم نـەبووە کـچی خوشـکم بکـوژم مـن خۆشـم دەویست، بەڵام ئـەو دەرزییـە لەباسـکمدا شـکا بـوو، داوام لێ کـرد باسکم بگەزێ تا لێ ی دەربێنێ، لەئاکامدا قوتی داو مرد. دوایی بە (٢٠) ساڵ زیندانی کرا، بەڵام دوایی تێکـدانی یـەك خێزانـی تـەوا و ئارام، بەهۆی ئەوەی ئەم خاڵە جڵەوی ئارەزووەکانی بەردا بوو، جەرگی خوشکی سوتاند، کەهێشتا (٥) ساڵی تەواو نەکردبوو.

## چیرۆکی بیست و پێنج:

# بەم شێوەیە دەست درێژیم لەسەر پورم کرد !!!

(ن.م) لاوێکی (٣٨) ساڵەیە، بەرلە (٢٠) ساڵ لەگەڵ جیهانی بێ هۆش کەرەکاندا گەشتی خۆی دەست پێ کردووە. لەگەڵ یەکەم گەشتیدا لەدەرەوەی شانشین دا لە (١٨) ساڵی داسەر بوردەی خۆی دەگێڕتەوە:

کۆمەڵە گەنجێ بووین لەولاتی خوراٺاواداو هاورێی یەکتری بووین، لەکاتێك لەوێ بووم، لەگەڵ کچێکدا بەناوی (جاکلین) دۆستایەتیمان گەرم بوو، بە بڕەیەکی سەیر مادده هۆشبەرەکانی بۆ ئامادە دەکردم، بەتایبەتی لەکاتی کرداری سێکسی لەگەڵیدا، بەخێرایی ماوەیەك ڕابرد، کاتی گەڕانەوەم بۆ شانشین هات، ئاماوەی پشودان لەوێ بەسەرببەم، لەکاتی گەڕانەوەمدا بڕێکی زۆر ماددەی هۆشبەری بۆ خستمە ناو جانتاکەمەوە، کەبەشی ئەو ماوەیەم بکات، تا ئەو کاتەی بۆ وڵاتی ئەو دەگەڕێمەوە.

لەوڵاتی خۆماندا پیاوێکم ناسی بەناوی (ابو رعد) و پەیوەندیمان خۆش بوو، شارەزا بوو لەو جێگایانەدا، کەبڕێکی زۆر ماددەی

سرکەری یـان تێدایـە، لەهەنـدەران لـەرێگای (جـاکلین)ەوە مـاددەی هۆشبەرم بەدەست دەهێنا، لەولاتی خۆشمدا لـەرێگای (ئـەبو ڕەعـد)ەوە، (١٣) ساڵ لەو دۆخەدامامەوە، پاش ئەوە خوم پێوەگرت و هـۆگر بووم، بەو ماددانەوە دە خەوتم و بێدار دەبومەوە.

خوشکێکم هەبوو زۆر بەخۆشگوزەرانییەوە دەژیـایـن، زۆربـە نـازو خۆشیەوە گەورە کرا بووین. هەموو داوایـەکمان بـێ وەسـتان ئـەنجام دەدرا. بەتایبەتی لە لایەن دایکی بەسۆزمانەوە، کە دوری باوکمـان و گەشتی زۆرو دوری هەراسانی کرد بوو، چەند ساڵ ئاوامابینەوە، دایکم لەمن کەوتبوو گومانەوە بەتایبەتی کە زۆرلە گـەرماودا دەمامـەوە، دەیوت: بۆچی کات ژمێرەکی تەواو لەوێدا دەمێنێتەوە؟

بۆچی چاك خواردن ناخۆیت؟ بۆچی هەنـدە ماندووشـەکەت دەبـی، بۆچی ئەو هەمووشتانە ئەی کوڕەکەم؟

لەبەر ئەو هەموو پرسیارە گوماناوی و بێزارکەرانەدا بە چاکم زانی باربکەمە ماڵی پـوور (پلـك)م، کـە بێـوەژن بـوو. دەڵـێ: لـەوێ دا بەهەوەسی خۆم ئەو ماددانەم بـەکار دەهێنـا، بـۆ هـۆگری خـۆم بـێ ئەوەی کەس بێزارم بکات. ئەوانەی لەوخانووەدا بوون سێ کەس بـوون (پورم کەسی ساڵ دەبوو، خزمەتکارەکەی و شوفێرەکەی).

پوریشم ژوری جیای لەو خانووە بۆ جیا کردبوونەوە.



کەس نەبوو لەماڵی پوورمدا لەهەڵس وکەتم بپرسێتەوە، بەڵکو پوورم زۆر سۆزی خۆی دەدامێ، زۆر دەچومەلای. سێ ڕۆژ دەمامەوە پاشان بۆ ماڵەوە دەگەڕامەوە. لەو ماوەیەدا لە زانکۆ دابڕا بووم، زمانی ئینگلیزیم دەخوێند، لە بەرامبەریشدا وەتەرو ژێی وەرگرتنی ئەو ماددانەم زۆر هەڵسابوو، گەر نەمخواردبایە توشی هستریا دەهاتم.

لەکاتی هاتوچۆمدا بۆ لای پووری بێوەژنمدا ڕوداوەکی کت وپڕ لەماڵدا، کە دەنگ دەداتەوە چاوەڕێ دەکات، باوکم بەڕاشکاوی بەدایکمی وت: ژنەکی تری هێناوە سێ منداڵی لێ هەیە.

دایکم لەگرفتەکی تونداو زەبرەکی دەرونی دا دەژیا، نەدەهاتەوەسەر خۆی، بەڵام وردە وردە کارەکەی پەسەند دەکرد، بەوکارە ڕازی بوو، بەڵام داوای لە باوکم کرد ژنەکەی و منداڵەکانی بێنێتە ماڵمان، تا ئەو زۆرتر لەماڵمان دابەزرێ، باوکم بەداوای دایکم ڕازی بوو.

بەڵام ئەو کارە لە بەرژەوەندی مندا نەبوو، مانەوەی باوکم لەماڵەوەدا بۆ ماوەیەکی زۆر، کە تەنیا بۆ بازرگانی تایبەتی بڕواتەدەر لە بەرژوەندی مندا نەبوو، وای لێ کردم لەژێر چاودێری یەکی نیمچەیی دابم، باری لێ تەنگ کردم، بەڵام دوای نەمانی هەل، بێ ئەوەی باوکم پەی بەهۆگر بوونی من ببات، بەڵام هەمیشە

سەرکۆنەی دەکردم بەدۆڕاو تاوانباری دەکردم، کە توانای هیچ کارێکم نییە، لەهیچ کارێك سەرکەوتوو نیم. بۆیە بڕیارم دا ماڵی خۆم بەتەواوی بۆ ماڵی پوورم بگوازمەوە، کە دەرگەکانی بۆ من لەسەرپشت بوون.

لەوێ دا کەشێکی لەبارم دەست کەوت، دەیزانی من گەنجێکم پێویستیم بە ئازادی پتر هەیە، زۆر بەسەخاوەت خەرجی منی دەکێشا، سەرباری پارەی باوکم، کە لەکاتی لەماڵ نەبوونی دا دزەم بۆ دەکرد، تا هەمووی بۆ ئەو هۆشبەرانە خەرج بکەم.

تا ئەوتراژیدیاو کارەساتە هات، کەژیانی من و پوورمی کوشت، دەباپێکەوە بە ووشە گوێ بۆ ئەو ڕووداوە بگرین، کە لەوشەوە لێڵەدا قەوما، چۆن یاریزان گەمەبە تۆپ دەکات ئاوا ئەو هۆشبەرانە یاریان لەسەری مندا دەکرد، حەبێکی هۆشبەرو سڕکەر (المخدر)م هاورد خستمە ناو شەربەتێك، کە لەدەرەوەی ماڵدا بۆ پوورم هێنا، نۆشی پورم کرد، ئەوە بوو کەوتە ناو خەوەوە، لەوکاتەدا شەیتان لەکەللەی دام ئەو کارە بکەم، کە هەموو لەشێ دەلەرزێنێت. کاتێ سەیری پوورم دەکرد، کەلەسەر جێگا داکەوتوو.

لەخەوێکی قوڵدایە، بەرگی خەوی تەنکی کردۆتەبەر، شەیتان خەیاڵی بۆ کردم، کەبوکێکە و مانگێکی (١٤) ساڵانەیەو منیش ئەو



زاوایــەم چـاوەڕێ ی دەکـات، کـاتێ کـاری خـراپم لەگەڵـدا کـرد شوێنەوارەکانی کارەکانم لابرد تا هەست پێ نەکات. شەوی یەکەم بـێ تـرس ڕۆیـشت، بەداخـەوە دوای دوڕۆژی تـر دوبـارەم کـردەوە، هـاتم شەربەتم بۆ هێناو حەبەکی ترم هەڵدایە ناو، پوورم فـڕی لێ دا، زۆری نەبرد خەوت، هەمان دواێن پیسیم دوبارە کردەوە.

ئەم پلانەش هی خۆم نەبوو، هی (ابو رعد) بوو، کەپلانەکی درێژی بۆژیانی من کێشا بوو، ئەزمونەکانی لەبـەر دەسـتی منـدا دانـابوو، نەیدەزانی لەگەڵ نزیکترین کەسی خۆمدا تاقی دەکەمەوە. (ابو رعـد) دەیوت ئەم حەبەیە کاریگەرییەکی لەئاسایی بەدەری هەیە.

بەوشێوەیە لەگەڵ پوورمدا بۆ کاسەیێ شەربەت حـەبێکی سـڕکەرم دادەنا، بۆ ماوەیێ پوورم هۆگر بوو، خۆی پرسـیاری ئـەو شـەربەتەی لێم دەکرد، بەو ڕەنگە پـوورم چـووە نـاو جیهـانی هۆگرکردبوونـەوە، کەخۆم توشم کرد.

کاتێ دڵنیا بووم پوورم هۆگر بووە بەوحەبە ترسناکەوە، بێ ئـەوەی هەستی پێ بکـات ومنـیش ئـەو کـارە داوێـن پیـسییەم لێ دربـارە دەکردەوە.

هــەموو شــتێ بــێ تــرس بەســەر چــوو، شــەوێکیان پــەرداخی شەربەتەکەی لێ دەڕژێ، بێ ئەوەی من بزانم، داوای پـەرداخی تریـشم

لێ ناکات، چونکە سەر لەبەیانییە. من جلەکانم دانا وام زانی خەوتووە ولێ ی نزیك کەوتمەوە جلەکانی دابنێم تا ئەو کارەی شەوانی پێشو بکەمەوە. بەڵام کارەساتەکی گەورەی لێ کەوتەوە، پوورم لەسەر جێگا ڕاپەڕی و بەترسەوە هەستاو هاواری دەکرد، لەو کاتەدا نەم دەزانی چی بکەم، بەتایبەتی من هەستم بە قورسایی لەش و سەرسوڕکێ دەکرد، چونکە حەبم خواردبوو، منیش بەقەد پوورم ترس دایگرتبوم، کەخەیاڵ ناکرێت.

ئەوەی گرنگە پوورم بەجلەکانەوە دەری کردمە سەرشەقام، لەباری تاسان و هستریادا بوو، حەپەسا بوو، چونکە هەرگیز ئەوەی بەخەیاڵدا نەهاتبوو شتی ئاوا ڕوبدات.

گەڕامەوەماڵەوە، ئەم کارەساتە لەپوورم گەورە بوو، بەستەزمانە باری تەندروستی تێك چوو، ڕۆژێکیان نەزیف دەبێ، لە نەخۆشخانە چارەسەری وەردەگرێ و دکتۆر پێ ی دەڵێ ئەو خوێن پژانە هۆیەکەی منداڵ لەبار چوونە، کەسێ مانگە بووە.

پوورم ئەو ڕاستییە تاڵەی زانی، چونکە هەرگیز کەس دەستی لێ نەدابوو داوێن پیس نەبووە، بەو ڕووداوە بەتەواوی توشی داڕوخانی دەماری (الانهيار العصبي) هات و، مانگێ چارەسەری وەرگرت و ئاوامایەوە.

بەڵام باری دەرونی تێك چوو، لەناو ئازارو داخ لەماڵ گۆشەگیربوو.

دەیوت: چۆن کوڕی برام ئاوا بەسوك وئاسانی منی کردۆتە ژنی خۆی، چاکیش ئەزانێ من بەئەو ناشێم، بەوبیر کردنەوە قوڵە توشی زەبرەکی کاریگەر بوو، ئەو پوورە بەستەزمانەم لەمەڕاقاندا سەری نایەوە، کەدەستی تاوانبار ئەنجامی داو لەبەرامبەر چاکەی دا سپڵەییم نواند.

لەگەڵ مردنیدا گێژەڵۆیەکی دەرونی ترسناك گرتمی، یەکەم جار بۆ دەرەوەی شانشین گەشتم کرد، تا چارەسەری ئەو هۆگریەو ئەو بارە دەرونییە سامناکە وەربگرم. ساڵێك لەهەندەران لە نەخۆشخانە مامەوە، وەکو دەمبینن خەریکی چاك بونەوەم، بەڵام لێرەدا برینەکی قوڵ هەیە پزیشکان هەرگیز زەفەری پێ نابەن، کە هەستکردنی قوڵمەبەوە، کە ژیانی خۆم تێك داو وازم لەزانکۆ هێناو، هۆگری مادده سڕکەرەکان بووم و، بەوەش نەوەستام هەڵسام ژیانی پوورە بەستەزمانەکەم ڕوخاند[٤].

---

(١) بەڵێ پێغەمبەر -دخ- بەر لە شارستانی نوێ ئاماژەی بەکارەساتە ترسناکەکانی دواڕێن پیسی و ماددەسەر خۆشکە رەکان کردووە: ( عفوا عن نساء الناس تعفوا نساءکم). رواه الحاکم( صحیح. واتە: لەگەڵ ژنی خەڵکی داوێن پاك بن ژنانی ئێوەش داوێن پاك دەبن. (اجتنبوا کل مسکر). رواه الطبراني- صحیح. واتە: لەهەموو ماددەیەکی هۆشبەر خۆدور بگرن. (وەرگێر)

چیرۆکی بیست و شەش:

# بکوژی ژنەکەی

ئەو بە ژنەکەی ڕاگەیاند بوو من نەمێردم و توشی پەك کەوتنی سێکس (العجز الجنسي) هاتووم، کەچی دوای چەند مانگێ منداڵەکی پەیدا دەبێت.

بکوژی ژنەکەی بەدرێژییەکی وروژێنەرو تاوانی ئابڕوویی گێڕاوەتەوە، کە ئەسکەندەرییەی هەژاند. ئەو پیاوە ژنە گەنجە خزمەتکارەکەی دەخوازێ و ئەویش دان (بەلاوازی سێکس)یدا دێنێت. کەچی ژنەکە هەواڵی دەداتێ کەلەو دوگیان بووە.

پاشان دان بەوە دا دەنێێ، کە پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ کەسێکی تردا هەبووە. بۆیە منداڵەکەی دەخنکێنێ، پاشان بەچەقۆ ژنەکەی کەلە پاچە دەکات.

شاری ئەسکەندەرییە لەمیسرڕدا بەڕوداوی ئەو پیرەمێردە هەژا، کە ژنە گەنجەکەی و شیرە خۆرەکەی دەکوژێ و لەشیان کەلە پاچە دەکات و دەیخاتە سەر ئاگرو دەیکوڵێنێ، دوای ئەوەی دان بەناپاکی دا دێنێ و ئەویش (پەك کەوتنی سێکس)ی خۆی پێ ڕادەگەیەنێت وەکو



نەنگی یەك.

مێردەکە لەکاتی لێکۆڵینەوەکان دەری خست، کەئەو تەرمەیەی دوورۆژان هەڵگرتن، ئەو ژنەیە بەر لەهێنانی خزمەتکاری ئەو دەبێ، هەرچەندە ئەم پیرەمێردە پێی دەڵێ: من پیرم ناتوانم ئەرکی سێکسی ئەنجام بدەم، بەڵام ئەو زۆربە زویی پێشنیاری هاوسەرێتی پەسەند دەکات.

ئەم تاوانبارە زۆربە کەمتەرخەمی لەم تاوانە دا ژنەکە هەتك دەکات، کەچەند پارچەیەك لەگۆشتی ئەوان فڕێ دەداتە ناوچەی (العطارين) و، بەڵام لە کاتێ دا گۆشتی بیلالی کوڕی هەتك دەکات و دەیکوڵێنێ لەناوچەی (العصافرة) دا لەگەرەکێکی خاوێندا فڕێ ی دەدات توشی بارێکی دەرونی توند دەبێت. بەڵام لەڕاست ژنەکەدا و کوشتن و هەتك کردنی دا گوێ ی لێ نابێت.

بەئاکامی لێکۆڵینەوە بە دەرکەوت، کە تاوانبارەکە ژنی یەکەمی لەدێژە مردووەو کوڕێکی لێ هەیە (٢٨) ساڵە، لەگەڵ کچێکدا (٣٥) ساڵە، بەهۆی هاوسەرگیری لەودا بڕاون.

خزمەتکارەکەی مێردی پێ دەکات، پیرەمێردەکەش دانی پێدادێنێ، کە (توانای سێکس)ی لاوازە. بەلێکۆڵەرانی وت: ئەو کوژراوە ژنی دووەمیەتی، کە وەکو خزمەتکارو خاوێنکەردوەی ماڵ و

خۆراك ئامادەكەر كاری كردووەو، یەكێ لەبرادەرانی بەرلە (٥) ساڵدا بۆی دەدۆزێتەوە.

وتی: كاتێ ئەو ژنە مێردی پێ دەكات (٢٥) ساڵە دەبێ، من پێیم ڕاگەیاند بوو من (٦٠) ساڵەم و توانای سێكسیم كەمە، بەڵام ئەو زۆر گرنگی بەمە نەدا، بەڵكو دانی بەوەدانا، كە ڕابردوو سێ مێردی تری كردووە، دویان عورفی بوون و یەكێكیان بەڕەسمی و فەرمی بووە.

من (١٩٩٩ز) ئەوم ناسی و لەگەڵی دا ڕاهاتم و زۆر بەسەخاوەت خەرجم بۆ دەكێشا، كاتێ هاوسەرگیریم لێ پێشنیار كرد، زۆربە گەرمی ئاوڕی لێ دایەوە، هەرچەندە نێوانی تەمەنمان (٣٥) ساڵ بوو.

وتی: من دەمەوێ ژیانەكی هێور بەسەربەرم، دوای ئەوەی سێ مێردی ترم كردووەو دومندالم لێیان هەبووەو لێم دووركەوتونەتەوە، ئەمەش وای لێ كردم بەزویی لەخێزانەكەی داخواز بكەم و پارەیەكی زۆری پێ بدەم.

دوای چەند مانگێ هەواڵی دامێ ئەو دوگیانە، منیش پێم سەیر بوو نەیاریم نەكرد و گومانم لەدڵمدا هەڵگرت، دوای ئەوەی جەختی كرد ئەوە منداڵی منە، من لەگەڵ ڕوداوەكە ڕۆیشتم تا دوای (٤) مانگ بیلالم پەیدا بوو.

ئەنجا گومانم بوو بەیەقین، چونكە چەند جارێ بانگی بنكەی

پۆلیس کرا، کە ماڵی مـن سـەربە ئـەوێ بـوو، ڕایگەیانـد کـە ئـەو ساختەیی کـردووە، چـونکە کـوڕە پێـنج سـاڵانەکەی دابـوو پـاڵ دووکەسان، یەکەمیان مێردی کۆنی، دووەمیان پیاوێ، کە پەیوەنـدی لەگەڵدا هەبووە، دو بەڵگەنامەی منداڵ بوونی دەرهێنـا بـوو لەهـەر یەکەیاندا دابوایە پاڵ باوکێکی جیا لەئەوی تریان دا.

کاتێ چەند جارێ ئەم مەسەلەیەم بەڕودا هێنا، وتـی: ئـەم شـێرە خۆرەیە، کە بیلالە کوڕی تۆنییە، بەڵکو لەپیاوێکی ترە، کە بـەر لـە تۆ پەیوەندیم لەگەڵدا هەبووە، من لەو کاتەدا شێت بووم، بۆیە کـاتێ ئەو ژنە خەوت بیلالم بێ بەزەیی یانە خنکاند. بـەڵام لەخـەو هەڵـساو بێدار بۆوەو سۆراغی منداڵەکەی کرد منـیش بـەمردووی لەبـەردەمم دانا، ئەویش وەکو شێتان هاواری دەکرد، کە فریام بکەون.

منیش چوم لە چێشتخانەی ماڵەکەمان چـەقۆیەکەم هێنـا، چـەند دانەیەکم لێ دا، پاشان کوشتمەوەو دەم وچاویم شـێواند و بـۆ بـانێوم گواستەوە، تا دو ڕۆژان مـن گۆشـتم لـە لەشـی ئـەو دەکـردەوە، بـە قەبارەی جیا جیا، گەدەو هەندێ لەسمتەکانی لەناو بـەفرگردا دامنـا، تا هـەر پارچـەیەك لەشـوێنەکی ئەسـکەندەرییە فـڕێ بـدەم. ئینجـا مەنجەڵێکی گەوردم هێنا گۆشتی ئـەو منداڵـە سـاوایەم تێـدا پارچـە پارچە کردو ئاو کوڵم کرد، ئینجا پارچە پارچەم دەخستە نـاو حـەوزی



گەرماوەوەو، سیفۆنەکەم بە خێرایی دەکردەوە تـازوو ڕزگـارم بکـات، هەرچی ئێسقانی بوو بەسەگەکانی سەر شەقامەکانمدا.

پاشان پیل و ڕانی ژنەکەم کەل و پارچە کردو کولاّندنم تا بەهـەمان ڕێگا خۆمی لێ ڕزگار بکەم، پاشان قۆناغی پارچە گەورەکانی لەشـی هـات، کـە بـەدژواری خۆیـان لێ ڕزگـار دەکـرا، پارچـە دەکـران و دەکولێنران، کە ناوچەی حەوزو سمتەکانی بوون، کاتێ نۆرەی سەرهات کەوتمە ژێر دەستی پۆلیسەوە.

سەرەتا هەولّم دا نکـۆڵی بکـەم لـەوە کـە ژنەکـەم بـە مردنێکـی سروشتی نە مردبێ، چـونکە لـەخزمانی دەترسـام، بـەلاّم درۆیەکـەم سەری نەگرت چونکە پاشماوەی جەستەکەی لەماڵمدا مـابۆوە. دوایـی وتی: تێکەلاّو نەبوونم لەگەڵ خەڵکی هەلێکی باش بـوو، تـا ئـەوەی ماوەتەوە لەم تاوانە تەواوی بکەم، بێ ئەوەی کەس هەستم پێ بکات.

بکوژەکە هیچ سیمای پەشیمانی پێوە دیار نەبوو، کە ئـەم تـاوانی کردووە، بەڵکو دەڵێ: من نەم دەتـوانی لەگـەڵ منـداڵێ دا بـژیم لـە نەژادی دا گومانم هەبێ، هەلی ئەوەم نەدەدا پیاوی تر فریو بدات.

## چیرۆکی بیست و حەوتەم:

# باوکەکی لاسار

ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانی مافەکانی مرۆڤ لە (سعودییە) دکتۆرە (سهيلة زين العابدين) داوای کرد توندترین سزای ئەو باوکە بدرێ و بگاتە ئاستی تۆڵەی کەسانی ڕێگر (حدالحرابة)، لەشاری مەدینەی پیرۆزدا کە جەستەی کچە بچکۆڵەکەی ملکەچی ئارەزوە ئاژەڵییەکانی دەکات.

ئەم دکتۆرە وتی: (پێویستە سزای ڕێگری بەسەر باوکی ئەو کچە (١٢) ساڵانەیەدا بسەپێنرێ، کە کوشتنە بەشمشێرو لەدار دانیەتی.

هەروەها وتی: کۆمەڵەکە سەر قاڵی لێکوڵینەوەی باری منداڵەکەیە لەنزیکەوە تابزانن چەندە ئازار بەر منداڵەکە کەوتووە، جەخت لەسەر ئەوە کراوە سەرکەتوترین چارە بۆ ئەو کارەساتە حاواندنەوەیەتی لە دەوری هەر پاراستنەکی کۆمەلآیەتی دا.

ڕۆژنامەی (الوطن) لەسعودیەدا لەچەند سەر چاوەیەکی پەیوەندبە پیاوەکەوە ڕایگەیاند، تاوانبار تاوانی تریشی لەسەر سوربۆتەوە، ڕابردوو لەسەر بابەتی ماددە هۆشبەرەکان و خواردنەوەیان حوکم دراوەو لەناو کۆمەڵگادا کەسێکی پشت گوێ خراوبووە.

سەرچاوەکان ڕایان گەیاند، سەرەتا ئەو پیاوە لە (کوێت) ژیانی

بەسەر بردووە، پاشان بۆ شانشین گەڕاوەتەوە تا سەرەتای منداڵی لەوێ تەوا بکات و لەمەدینەی پیرۆزدا بژیت. بەڵام خێزانەکەی بەپەلە هەستیان پێ کرد، کە ئەو لایداوەو ماددەی هۆشبەر دەخوات، هەرچەندە باوکی هەوڵی دا لەو تاوانە دوری بخاتەوە ژنی بۆ هاورد، کەچی لەگێڕانەوەی دا سەرکەوتوو نەبوو.

ئەو باوکە سەرنەکەوتنی خێزانی و کۆمەڵایەتی وپیشەیی، بەوە قەرە بوو کردەوە، کە ڕوولە کچەکەی بکات تا ئارەزوەکانی بەو بەتاڵ بکاتەوە، وەکو لێکۆڵینەوەکان ڕایانگەیاند ماوەیەکی زۆرە ئەم کارە دەکات، ئەم کارەیە ڕەوتێ بوو لەبازنەی مرۆیی خۆی چووەتە دەر تا لەئاستی ئاژەڵی نزیك ببێتەوە. هەرچی دایکی منداڵە قوربانیەکە بوو، لەپڕ ڕا بانگی پۆلیسی (عەقیق) واقی وڕماند، کە بانگی براکەی کرد بێت خوشکەکەی بباتەوە، بەر لەوەی ئەو دایکە دوای بیستنی ئەم ڕوداوە توشی دارمانی دەماری دەبێ، کەزۆر دەمێك بووە ئەو تاوانە کراوە بێ ئەوەی بەمەسەلەکە بزانێت.

باس دەکات باوکەکە تەمەن (٤٢) ساڵ بووەو هاوسەری هەبووەو چەند کوڕەکی هەبووە، هەرە گەورەیان (١٦) ساڵانە بووەو هیچ پیشەیەکی نەبووە تەنیا چەند کارەکی سەرپێ یی و ئازاد نەبێ، کە زۆرتێ یاندا سەرکەوتوو نەبوو.



**چیرۆکی بیست و هەشتەم:**

## ئەو کەسەی زینای لەگەڵ دایکی دا کرد!

جارێکیان لەدادگا بووم، لای یەکێ لە قازییەکان بووم، کە هاوڕێ ی من بوو، ژنەکی بەتەمەن هات دەهات و دەچوو، هاتە ژوورو پاشان چووە دەر.

وتم: مامۆستا بەسەرهاتی ئەم ژنە چی یە؟

وتی: (لاحول ولاقوة الا باللە). ئەم ژنە کوڕێکی هەبوو ماددەی هۆشبەری دەخوارد، گەر سەرخۆش دەبوو دەهاتە لای داوای پارەی لێ دەکردو هەڕەشەی لێ دەکرد تا لەترساندا دەیدایە.

جارێکیان چەقۆی بەدەستەوە هەڵدەگرێ ووا دەزانێ پارەی دەوێ، ئەویش پێ ی دەڵێ: باشە دەتدەمێ، بەڵام ئەم جارە پێی وت لەسەر جێگا بکەوە، لەژێر فشاری چەقۆ دانیازی لەگەڵدا دەکات.

قازی وتی: کوڕەکەمان ئامادە کردووە و دادگامان بۆبەستوو حوکمی کوشتنمان بۆ بڕیارداوە، وەکو لەفەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە: (من وقع على ذات محرم فاقتلوه). رواه الترمذي وابن ماجه.



چیرۆکی بیست و نۆیەم:

# باوکە باوکە
# هەردوو دەستەکان و قاچەکانم بدەوە

شوێنەکی تازەیەو کەل وپەلەکانی نوێیە، ئەم پیاوە پارەیەکی زۆری خەرج کردون، تا کردوویە بەگوڵێ لەجوانی و ڕازاوەیی دا.

پاشان ژنەکەی بردە سوێ و سەیری کردن زۆر دڵی پێ خۆش بوو.

دوای چەند ڕۆژێ بۆ ئەوێیان بارکرد، بەرەبەیانی ڕۆژی یەکەم ئەو پیاوە چووە سەرکارو ژن ومنداڵی بەجێ هێشتن، یەکێ لەو منداڵانە کارەکی لاساری و خراپ ئەنجام دەدات، چەقۆیەك دەست دەکاتێ، دەچێ یاری بە کەل و پەلی ناوماڵ دەکات و قەنەفەیەك و کورسی یەك هەڵدەدڕێت. کاتێ باوك گەڕایەوە ماڵەوەو بینی ئەو منداڵە ئەو شەیتانییەی لەماڵدا کردووە زۆر تورە دەبێ، پەتەکی دەست دەداتێ دەست و قاچی منداڵە گەورەکەیان دەبەستێتەوە.

منداڵەکە دەست بەگریان و پاڕانەوە دەکات، بەلاّم لەگەڵ باوکی دابێ سود دەبێ، کە تورەبوون و چاوی سوربوون و خۆشەویستی دنیا کوێری کردووە. دایك هەوڵی دا ڕزگاری بکات، بەلاّم پێ ی دەڵێ:

گەروا بکەی تەلاّقدراوی. بەو شێوەیە منداڵەکە گریا گریا تا لەپەل و پۆی خست و هێزی لێ بڕی و بورایەوە.

لەپڕ ڕا شین و مۆر بۆوە، باوك ترساو دەست وقاچی کردەوەو، بەپەلە گەیاندییە نەخۆشخانە، چونکە بورا بۆوە، دوای پشکنینی پزیشکی دکتۆرەکان ڕایان گەیاند دەبێ هەر چوار پەلەکانی ببڕینەوە، چونکە خوێنی توشی ژەهراوی بوون بووەو گەر خوێنەکە بگاتە دڵ دەیکوژێت. ئەوە بوو بڕیاریان دا بیانبڕنەوە، باوك ئیمزای کرد، فرمێسکیش لەچاوی وشك نەدەبونەوە، کارەساتەکە لەوەدا بوو کاتێ منداڵەکە لە نەشتەرگەریەدا هاتەوە هۆش، سەیری باوکی کردوو وتی: باوکە، باوکە دەست و قاچەکانم بدەوە جارەکی تر ئەو کارە ناکەمەوە.



## چیرۆکی سێیەم:

# تەلەفزیۆن لەماڵی من ببە دەرەوە

دوو پیاو بوون لەبەر خاتری خودا پەیوەندییەکی گەرمیان لەمابەینیاندا هەبوو، یەکێ لەوانە هەڵسا تەلەفزیونی هێنا ماڵەوە، بێ ئەوەی هاوڕێکەی پێ بزانێ، دوای ئەوەی فشارەکی زۆری خستە ژن و منداڵەکانی.

خاوەن تەلەفزیۆن کە مردو دوای بەخاك سپاردنی، ئەو برادەرە خەمبارو خۆڕاگری ڕوی لەمزگەوت کردو لەوێ دا نوست، لەخەونـدا بینی برادەرەکەی دەم و چاوی ڕەش داگیرساوەو ئاسەواری ماندوبوون و داهێزرانی پێوە دیارە، وەك بلێی ی سزای خوای لەسەر بێ، پرسیاری لێ کرد هاچیتە؟ وتی: ئەی فلان بڕۆ ماڵمان ئەم تەلەفزیۆنە لەماڵمان لاببە، هەر لەوکاتەوە هاتومە ناو گۆڕەوە بەهۆی ئەوەوە سزا دەدرێم.

ئەنجا شوێنی نوستن دەگۆڕێ و لەبەر زۆر ماندوو بوون دەخەوێتەوە، جارەکی تریش برادەرەکەی دەبنێتەوەو دێ بەشەق لێ ی دەدا هەڵسە ڕاپەڕە قسەی نێوان من و خۆت لەیاد کردووە. توخوا بچۆ ماڵمان

پێیان بڵێ هەبوونی تەلەفزیۆن لەماڵەوە ئەگەر کاتژمێرێکیش یان خولەکێکیش بێت، خراپەو سزای من زیاتر دەبێت.

ئەنجا چومە ماڵیان، گەرییم تەلەفزیۆنی لێ یە بڕوام نەدەکرد، چومەلای منداڵەکان داوام لێ کردن ژن و منداڵەکان نزیك بکەونەوە تا گوێیان لەقسەکانم بێ: منیش خەونەکەم گێڕایەوە، ئەوانیش گریان و منیش گریام.

یەکێ لەو منداڵانە کە هۆشیار بوو باوکی خۆش دەویست تەلەفزیۆنەکەی خراپ کرد، منیش سوپاسی خوام کردو گەڕامەوە، پاشان لەخەونمدا بینیم خۆش حاڵ و کامەران بوو وتی: خوا دەروت لێ بکاتەوە چۆن دەروت لەمن کردەوە[٥].

---

**(٥) بێگومان تەلەفزیۆن و ئەنتەرنێت و موبایل و هتد.... ئەم ئامێرانە بۆ خزمەت کردن بە مرۆڤ دروست کراون و زانست و هەواڵەکان لەدنیادا لە کەمترین کاتدا دەگەیێنن، بەڵام ئەوەی ئەو دەزگایانە حەرام دەکات بەرنامەو پرۆگرامە لادەرەکانیانە، کە جیهان هاندەدەن بەرەو خراپەکاری بڕوات و لەڕەوشت و بەها مرۆیی یەکان دوربکەونەوە. (سنريهم اياتنا في الافاق وفي انسهم حتى يتبين لهم انه الحق). هەروەها بۆمان دەردەکەوێ لەم بەسەرهاتەدا کە خەونی خوایی (الرؤيا الصالحة) بەشێکە لە (٤٦) بەشی سروشتی پێغەمبەران و مژدەو ئیلهامێکی فریشتەیە (ذهب النبوة وبقيت المبشرات)رواه ابن ماجه (ئامادەکار)**

**چیرۆکی سی ویەك:**

# تاوانبارەکە باوکمە

ڕاستە من هێرۆیین و مادده سڕکەرەکان دەخۆم، بەڵام نامەوێ هۆکاری توش بوونم بگێڕمەوە، چونکە هۆیەکە باس بکەم زیاتر ئازارم دەدات، کەهەر خودا بزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە.

سەردەمی منداڵیم لەسۆزو خۆشەویستی نێوان باوان و براکانمدا بەسەر برد، تا گەیشتمە (١٥) ساڵانە، ئەو کات لەقۆناغی ناوەندی دەمخوێند، ڕۆژێکیان چومە ژووری باوکمەوە، بینیم لەباری ئاسایی دا نییە. بینیم هەندێ تۆزی ورد کە (المسحوق) هەڵدەگرێ لەسەر پەڕەیەکی فافۆنی دادەنێ و هەڵی دەمژێ، پاشان بەچەند جولەیەکی سەیر هەڵدەستێ شتی ئاوام نەبینی بوو.

نەمدەزانی چی ڕویداوە، هەرگیز ئەو تۆزو وردەیەم نەبینی بوو، هەتا لەڕاست مادده هۆشبەرەکان هیچم نەزانی بوو، بەر لەهەموو ئەوشتانە، من دەمویست لەهەموو شتێ دا وەکو باوکم بم، چونکە ئەوم لەهەموو شتێکدا بەچاوساغی خۆم دەزانی. لێ ی چومەپێش، وەکو سۆراغ ویستم بەشداری بکەم لەگەڵی دا، بەڵام منی دەرکردو هەڕەشەی لێدانی کردم. لەژوور چوومە دەر، بەڵام ئەم دیمەنەم لەیاد

نەچــۆوە. دوای ماوەیــەك چــوومەوە لای بــاوكم هــەمان دیــەنم بینیەوە.لەدڵمدا ئارەزوی لاسایی كردنەوەی ئــەوم كــرد، تــا دووبــارە هەڕەشەی لێم كردەوە.

بەڵام دوای سوور بوونم بەشێكی لەو تۆزە پێدام، بەڵام بەومەرجەی نەیخۆم چونكە باوكم بوو بەزەیی بەمندا دەهاتەوە و لەبەژەوەندی مندا بوو.خۆزگە مــەرجی هەرئــەوە بوایــە، بــەڵام بەداخــەوە وتــی: دەبــێ لەژورێكی تردا بیخۆی، منیش چوومە ژوری ترو بــەكارم هێنــا، لــەو كاتەدا توشی زەبرەكی گەورە بــووم ودڵــم تــەنگ بــوو چــومە دنیــای ئەندێشەو هۆگریەوە.

هەرلەو هۆگریە بەردەوام بووم، تا هــەواڵی مــن كەوتــە بــەرگوێ تاكێكی خێزانێكی دۆســتمان و هاتــەلام و ئامۆژگــاری زۆری كــردم، خــودا پاداشــتی بداتــەوە، پاشــان پێــشنیازی كــرد لەنەخۆشــخانەی (الامل) خۆم چارە بكەم، بۆ ئەمە پەیوەندی بە بەرپرسانیەوە كرد، تا لەو دۆزخەی كەوتومە ناویەوە دەرم بێنێت. من خــۆم هەڵدەســوڕێنم، ڕەنگە ئیمڕۆ لەدوێنێ باشترم، بەڵام شتێ هەیە لەو دوێنێیەدا لەیادنا كرێ، كە ئەوەیە من قوربانی بووم و باوكم تاوانبار بوو.برینەكی قوڵە لەدڵدا سارێژ نابێ. ستەمی خزم و نزیكان بۆ سەر دەرون لەشمێــشری تیژ بڕندە ترە.

## چیرۆکی سی و دووهەم:

# بۆچی براژنی خۆی کوشت ؟

لەنیوەڕۆییەکێ هەواڵ بەژووری چالاکیەکان گەیشت، کە دەورییەی ئاسایشی هەیە، چونکە ژنێك و دوو منداڵ لە گەڕەکێکی (الریاض) دا کوژراون، لێکۆڵەرەوە چووە شوێنی ڕووداوەکە، گەیشتە شوێنی ئەو تاوانە، کاتێ چووە ناو شوقەکەو تەرمی ژنێکی بینی، فڕێ درا بوو سەر ڕێگای شوقەی ناو خۆوە، شوێنەواری لێدانی چەقۆ بە پشتەملی و گوێچکەیەکیەوە بوو، پاشان لێکۆڵەر چووە ژووری تەنیشتی تا ئەو دوو دیمەنە دڵتەزێنە ببینێ، کە دوو منداڵ بەهەمان ڕێگا کوژراون، کەتەمەنی یەکێکیان (٤) و ئەویتریان (٢) ساڵەیە.

لێکۆڵەر دەستی کرد بەپشکنینی شوێنەکە، بینی شوێنەکە هیچی لێ نەدزراوە، سەرباری بوونی پارەو زێڕ لەوژوورە سەرەکی یەدا، لێکۆڵەر بینی هیچ کونێ نییە بۆ شوقەکە دەرگای دەرەوە نەبێ، وەهیچ شوێنەواری شکان بەدەرگاکەوە دیار نەبوو.

ئەو بەڵگانە بەدیاریان خست تاوانبارەکە کەسێکی ناسراوی ئەو خێزانەیە، یان خزمیانە، سەرەتا تاوانەکە ئاڕاستەی سێ کەسان کرا



(مێردو دووبرای مێرد)، بەڵام دوای سەلماندی بێ تاوانی ئەوان و دیاری کردنی شوێنی کاریان لەکاتی ئەو ڕوداوەدا بەردران. بەڵام برای دووەم گومانی کەوتەسەر، دوای لێکۆڵینەوە بینرا برایەکە خراپەکارە، لاسارەو بەدڕەوشت و شەڕاب خۆرو، بێ کارە، ئەو گەنجە نەیتوانی شوێنی خۆی دیار بخات.

دوای سۆرغ کردن دەرکەوت ناکۆکیەکی کۆن لەنێوان ئەو گەنجەو کوژراوەکەدا هەیە، ڕۆژێکیان کوژراوەکە بەر لەچەند ساڵێ نەخۆش دەکەوێ، داوای خوێنی بۆ دەکرێ، گەنجەکەش دەچێتەپێش خوێن ببەخشێ، بەڵام ژنەکە قایل نەبوو و بە مێردەکەی ڕاگەیاند بەهۆی خواردنەوە خوێنی ئەو باش نییە، بەو هەڵوێستە گەنجەکە ڕقی لەبراژنی داگرت.

دوای چەند ڕۆژێ لێکۆڵینەوە لاوەکە دەری خست ئەو ژن ومنداڵە بەخوێنی ئەوان دەستی سوور بوون و ئەو ئەم تاوانە دزێوەی کردووە.

گەنجەکە وتی: من زۆر هاتووچۆی ماڵی براکەم دەکرد، گەر بەیانیان دەچووم براژنم خواردنی بۆ ئامادە دەکردم و براکەشم لەئیش بوو، ئەو دەهات لەگەڵمدا دادەنیشت. ڕۆژێ کارەساتەکە چوومە ماڵی براکەم و شەیتان ئەو کارە دزێوەی بۆ شیرین کردم و داوای خراپەیەکەم لێ کرد، ئەویش بەتوندی دەستی خۆی لێ دورگرت، بە

شوقەکە دا ڕاوم دەناو ئەویش بەتوندی نەی دەکرد، هەڵوێستەکە توند بوو، دوایی چوومە چێشخانەکەو دەستم دا چەقۆیەك و دامە بەرچەقۆ تا مرد. بەهۆی هاوارو قیژە منداڵێکیان هەڵسا، بینی دایکی دەکوژم، ترسام ئاشکرا ببم بۆیە منداڵەکەم کوشت، منداڵەکەی تریش بێدار بۆوە ئەویشم وەکو دایکی لێ کرد.

پاشان ڕام کرد. ئەمەیە ئاکامی گوناهو خواردنەوە وبێ ئاگایی. سکاڵا تەنیا بۆ لای خودایە.

**چیرۆکی سی و سێ:**

## ویستی مێردەکەی بکوژێ منداڵەکەی کەوتەبەرەوە

ئــەم بەســەرهاتەی دەگێڕایــەوەو فرمێــسکی بەســەر کۆڵمــەکانی دادەهاتن و لەپشتەوەی دیواری شیشەکانی بەندیخانەوە بوو:

مێردەکی دڕندەم هەبوو لە کۆمپانیایەکدا ئیشی دەکرد، تــەنیا پێنج شەممە و هەینییــەکان دەمــانبینی، گــەرکاتی گەڕانــەوەی نزیــك دەبۆوە وام دەزانی کاتی مردنم نزیــك بۆتــەوە، تــەنیا کــوڕێکی (١٠) ساڵانەم لێ ی هەبوو.

ژیانمان زۆربە ئەستەمی بەڕێوەدەچوو، لەسادەترین شت دا لێــی دەدام، جارێکیان ئەوەندەی لێدام خەریك بــوو گیــانم دەربــچێت. مــن بەخۆم هەڵناڵێم لەگەڵ ڕق وتوندی ئەودا من کەمتەرخەمیم لەڕاســتدا نەدەکرد.

لەبەر ئەو ڕەقی وتوندییە، شەیتان وەسوەسەی بۆ کردم، ژەهری بــۆ بکەمە چایەوە تاوەکو لەبەر دەستی ڕزگارم ببێت.

وەکو جاران پێنج شەممە بوو گەڕایەوە ماڵەوە، خــواردنم بــۆ دانــاو، وەکو جاران داوای چای کرد، منیش چایەکم بۆ ئامادەکردوو ژەهرەکی

خەستم تێ ی کرد، پاشان بردم لەبەر دەممدا دانا لەسەر خوانەکەی دا، تا گومانم پێ نەبا چوومە چێشتخانە تا ئەرکەکانم جێبەجێ بکەم. چەند خولەکێکی نەبرد کوڕە تاقانەکەم زیڕەی لێ هەڵسا، کە گوێ ی کەڕ دەکرد، منیش ڕام کرد بزانم چی یە، بینیم مێردم لەخەوێکی قوڵدایە، منداڵەکەشم چوو بوو ژووردوە بینیبووی ئیسکانی چای لەبەر دەمدا دانراوە، چوو بوو لەجیاتی ئەو خواردبویەوە. ئای لەو کارەساتە گەورە جگەری خۆم بینی، لەبەر دەم بکوژی دا هاوار دەکات، بەڵێ من کوڕی خۆم کوشت، وشەکانی وەکو تریشقە لەگوێم دا دەزرینگێنەوە، وەکو گرمەی هەور بەسەر دڵمدا سەدای دێ، کە دەیوت: دایکە، باوکە. بەڵام چی بکەم، ژەهرەکە کوشندە بوو، هاواری منداڵەکەم بەرز دەبۆوە و توند سکی خۆی گرتبوو، تا لەدەنگ و هاوار کەوت، چەند ساتەکی برد گیانی بەکردگاری سپارد. منیش ئیمڕۆ لە پشت ئەم شیشانەی دیواری زیندانەوەم، تا دەمرم ئەمەم لەیاد ناچێ، قەت دیمەنی منداڵم لەیاد ناچێ، کە لەبەر چاومدا خۆی لولدا بوو، قەت لەیادم ناچێ، من کوڕی خۆم کوشت.



## چیرۆکی سی و چوار:

# تراژیدیای کچێك

کچێکە کلۆڵیەکانی خۆی دەنوسێتەوەو، بەهۆی خۆشەویستی یەوە دەیچێژێت، ئەم کچە دەڵێ: من نامەوێ لەژێر هیچ ناوو نیشانێکدا تراژیدیاکانی خۆم بنوسمەوە، یان لەژێر هیچ فرمێسکێکی پەشیمانی دا، بەڵکو ناوو نیشانی بەسەرهاتی من بە بەسەرهاتی فرمێسکی پەشیمانی و داخ بنوسنەوە... ئەمانە فرمێسکێکی زۆرن ئازارو سوکایەتی زۆرم لەژێردا چێژتووە، هەموو ئەوانە بەهۆی ئەم تاوانەوە، کە لەڕاست خزمایەتی دا و لەڕاست خۆمدا کردم من سوك و ڕیسوا دەکەن، بەرلەوان لەڕاست خوام دا.

من کچێکم شایان بە بەزەیی پێدا هاتنەوە نیم، من خراپەم دەرحەق بە خێزانم و سەرجەم خزمانمدا کردووە، چونکە من ناپاکیم بەومتمانەیە کرد، کە ئەوان بەمنیاندا بوو، بەهۆی ئەو موبایلە نەفرین لێ کراوەی بووە هۆی دروست کردنی پەیوەندی یەك لەنێوان من و کەسێکی بێ ویژداندا و، هەڵی فریواندم و بەقسە شیرین و لوسەکانی لەخشتەی بردم و گاڵتەی بە سۆزو هەستی من کرد، تا

بەرێگای هەڵەی ئەودا برۆم، وردە وردە درێژە بەپەیوەندی نێوان خۆم و ئەو دەدەم، تا خوراترین خراپە، ئەمەش سۆنگەکەی خۆشەویستییەکی خەیاڵی دروستی کردبوو، کەمنی لەڕاست لێژایی ڕاستەقینە کوێر کرد، لەکۆتاییدا بەرێزترین شتم لەدەست دا کە هەموو کچان شانازی پێوە دەکەن، هەمیسان باوان لەکاتی گواستنەوەی دا بۆ زاوا شانازی پێوە دەکات، کەدێ بەحەلاڵی داخوازی دەستی کچەکەیان دەکات ، ئەو ئابڕووەم لەگەڵ کەسێکی بێ ئابڕوودا لەدەستدا، کە مرۆڤێك بوو، ویژدان و مرۆیی خۆی فرۆشت دوای ئەوەی هەموو شتەکی لەمن وەرگرت.

پاشان، منیش گرفتاری ئەوسات و کاتانەم کە ئەنجامدان، دوای ئەوەی دووگیان بووم لەناو کلۆڵی و گرفتارییەکی گەورەدا بەجێ ی هێشتم.

لەخوا زیاتر کەس ئاگای لەو مەرگەساتەی من نەبوو، گەر دەمویست سۆراغی بکەم لەبەرم هەڵدەهات، پێچەوانەی کاتەکانی بەر لەوەی ئەوە بەسەر مندا بێنێت.

تا چوار مانگ لەئاگری ئازارەکاندا دەژیام، هەر خوا دەزانێ چەندەم ئازارەکانی دووگیانی چەشت، بیرم دەکردەوە چۆن بەسکی پڕەوە، کە لەهەناومدا دەجولا برۆمە لای خزمانم. باوکیشم باوکەکی

لاوازەو موچەی کەمە... دایکیشم ژنەکی داوێن پاکەو هەموو شتەکی بۆمن تەرخان کردووە تا خوێندنم تەواو بکەم، تا باشترین موچە بەدەست بێنم، بەلاّم گومانی لەڕاست مندا نەهاتەدی و تاوانەکی وام ڕادەستی کرد، چاوپۆشی لیّ دا نەدەکرا، و تا ئێستاش ئێشەکانی دەچێژم.

لەپەیوەندی کردن بەم کوڕەوە نائومێد بووم، بەلّکو دلّی نەرم ببیّ، ئەوە دوگیانییەی خۆم پێی ڕاگەیاند، کاتیّ ئەوەم وت وتی: من یارمەتیت دەدەم بۆ لەبار بردنی کۆرپەلەکە، کەلە هەناومدا دەجولاّ، من خەریك بوو شێت بم، ئەو بیری لەوە نەدەکردەو بێتە خوازبێنیم من لەو کارەساتە ڕزگار بکات، بەلّکو منی لەناو دووگاشە بەردا داناوبوو، یان ئەوە تا لێم گەڕیّ چی دەبیّ بابیّ، یان یارمەتیم بدات بۆ لەباربردنی ئەو مندالّە، تا لەئابڕو چوون ڕزگارم ببێت. چەند ڕۆژەکی پیّ چوو نەهاتە داوام، بۆیە پۆلیسم ئاگادار کردەوەو ئەو کارەی ئەو بەسەری هێنا بووم لەدەستم نان، دوای دوو مانگ پشکنین دۆزییانەوە دوای ئەوەی ناوی خۆی بۆمن بەناوەکی تردا بوو.

پاشان کەوتە بەردەستی پۆلیس و دەستگیرکرا، دەرکەوت کەژنی هەیەو چوار مندالّی لیّ هەیە، کاتیّ بەندی کرا، منیش لەژووری ژناندا بەندی کرام، لەبەندیخانەدا هەوالّی دامیّ، گەرلای قازی نکوّلّی

لـەو بکـەم داهـاتوو دێتـە خـوازبێنیم و دەمگوازێتـەوە، بـەڵام مـن پێشنیاری کەم بایەخی ئەوم وەلانا، چونکە عەقڵ نایبڕێ جارێکی تـر بکەومەوە داوی. من کاتێ ئەوە دەنوسم کە لەزیندانی پۆلیـسەوە بـۆ زینـدانێکی گـەورەتر دەچـم، کـەماڵی منـە، ئێـستا مـن لـە وێ دا کەوتووم، نەکەس دەمبینێ، نە کەس دەبینم، چونکە ئابڕوم لەکـەدار بووە، ئێستا شەوو ڕۆژ دەگریم و لە خوادەپاڕێمەوە لێم ببـورێ لـەدوا ڕۆژداو داوای پاڕانەوە لەئێوەش دەکەم خـوا لـێم ببـورێ و ئازارەکـانم کەم بکاتەوە.

**چیرۆکی سی و پێنج:**

## مردو ئەم قسانەی دەگوتەوە:
## (بەشەکان وازی لێ مەهێنن)

ئافرەتێك نووسیویەتی: جەنابی شێخ بەرپرسیار لەجێگای (یا لەمن دین) لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت، خوا پاداشت و بداتەوە. من ئەم نامەیە لەجیاتی خوشکێکدا لەسوریاوە دەنێرم، کە سوێندی پێ خواردوم، ئەم نامەیەتان بۆ بنێرم، لەوتاری هەینی دا باسی بکەن و لەشوێنی خۆتاندا لە ئەنتەرنێتدا بلاّوی بکەنەوە، تا بەدڵی پیاوان لەباوكو میردان بگات.

ئەم بەسەرهاتە هاوڕێیەکەم بەدڵکی سوتاوەو. لەکاتێ دا مامی لەسەرە مەرگدایە دەنوسێت. دەڵێ: مامم نوێژێکی ڕواڵەتی دەکرد، تەنیا بۆ لاچوونی فەرز بەسەریەوە، ڕەمەزان ڕەمەزان نەبەوایە قورئانی نەدەخوێند، بەلاّم بەبێ ئەوپەندی لێ وەرگرێ، وە لەگەڵ بانکی سوودخۆر، سەودای دەکردو بڕوای وانەبوو قازەنجانی سوو ڕیبایە.

بەر لەمردنی بەسالێك چووە ناو بازرگانی بەشەکانەوە (الاسهم)

بورسەوە کە بانکەکی سوود خۆر بوو، ئەمەی خەمی سەرەکی بوو لەژیاندا.

ئەو تراژیدیایەی ئەو خوشکە باسی دەکات ئەوەیە، کەمامی توشی ڕوداوێ دێو بۆ نەخۆشخانەی دەگوازنەوە. دەڵێ: کاتێ چوینە سەردانی، لەسەرسەری وەستام تا شایەتمان بهێنی، بەلاّم شەیەتانی نەوتوو، وتی: دوای من بازرگانی بە بەشەکان (التجارة بالاسهم) وازلێ مەهێنن و مەیفرۆشنەوە.

بەداخەوە مردو دوا وشەی ئەم قسانە بوو، بەشەکان مەفرۆشنەوە...

کاتێ گیانی سپارد دەم وچاوی خوێنی تێزاو ڕەش هەڵگەڕا، داوای ئاکامی خێر بۆ خۆم و سەرجەم موسڵمانان دەکەم.

**چیرۆکی سی و شەش:**

## مردو ڕیمۆت کۆنترۆڵی کەناڵەکانی بەدەستەوە بوو

یەکێ لەمردوو شۆرەکان دەگێڕێتەوە، کەسێك ئاگاداری کردمەوە، کوڕەکەی مردووە، وەرە بیبە لەشۆرگەی مردووان بیشۆ، چووم لەبەر دەرگا وەستام و دەرگایان کردەوە، لە مردووەکەم پرسیار کرد؟ وتیان لەنهۆمی سەرەوەیە، چوومە سەرێ ئەو کوڕە لەژورەکدا بوو، جۆرەها ئامێری کات بەسەر بردنی تێدا بوون: تەلەفزیۆن، دیجیتال، کۆمپیوتەر. کاتێ چوومە ژوری گەنجەکە کارێکی سەیرم بینی، بینیم ئەوە گەنجەکە لەفافەکی سپی لەدەستی هالاوەو خوێنێ لێ دێ، منیش سەرم سوڕما. دەربارەی مردنی لەباوکی ئەوم پرسی چۆن بووە؟

لە وەلامەکە زۆر بەگومان بوو... پاشان وتی: ئەم کوڕەم هەواداری کەناڵەکان، بوو شەونخونی بۆ دەکردن، پێمان وت: وەرە خواردەوە نان بخۆ، ئەویش هەواڵی ناردبوو باخزمەتکارەکە خواردنم بۆ بێنێت. ئەوە بوو یەخزمەتکارەکەماندا خواردن بۆ ناردو لە دەرگاکەیدا نەیکردەوەو وەلامی نەدایەوە، ئەویش هاتە خوارو گێڕایەوە، منیش چووم لەدەرگام داو نەیکردەوەو وەلامی نەدایەوە، کە لەکونی دەرگاوە سەیرم کرد شتێکی سەیرم بینی، بینیم وەکو کوڕەکەم مردوبێ وایە،

بۆیە هەڵسام دەرگاکەم شکاند، بینیم کوڕەکەم مردووە، ڕیموتی کەناڵەکانی هەر بەدەستەوەیەو تەلەفزیۆنیش فیلمەکی سێکسی لەسەرە.لەوتەکادا حەپەسام و لەو مردنە وڕبووم و پەشیمانی و داخ دایگرتم، یەکەم شت کە هەوڵمداویستم ڕیمۆتەکەی لەدەست دەربێنم، بەڵام بەخودا نەمانتوانی ئەو ڕیمۆتە لەدەستی دەربێنین و بەدەستییەوە گیربوو بوو.

تەنیا ئەوەندەمان بەدەستەوە بوو کە ڕیمۆت و کۆنترۆڵەکە بشکێنین، کۆنترۆڵەکە شکا بەڵام دوگمەو وایەرەکانی وتەلەکانی هەربە دەستەوە مابوو، وتمان گەر دەستی ببڕین لەو ئابڕو چوونە ڕزگارمان دەبێ، بۆیە مشارمان هێناو دەستمان بڕییەوەو خوێنی لێ هات، بۆیە لەفافمان لەسەر داناوە.

مردوشۆر دەڵێ: بەباوکیمان وت دوای ئەوەی شوشتمان: بیبە با لەمزگەوتێ نوێژی لەسەر بکرێ، بەڵکو خودا لێ ی ببورێت. بەڵام باوکی ڕەتی کردەوە، منیش ڕۆیشتم بەجێم هێشتن.

سبحان الله! چۆن مرد، کاتێ مرد کەلەسەر کەناڵەکان بوو ڕیموتی بەدەستەوە بوو، بەخوا ئەوە کارەساتە، ئەمە کۆتایی ئەوانەیە هۆگری کەناڵە خراپەکانن. ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَاء أَجَلُهُمْ فَلاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾.﴿يونس/ ٤٩﴾.

**چیرۆکی سی و حەوت:**

# من و خەسووم

## (نەتەڵاقەو نەعیددەیە، تەنیا جیا بوونەوەیە)

ئـەم کـچە وتـی: بەسـەرهاتی خـۆم وەکـو پەنـدیّ بـۆ هـەموو کەنیشکەییّ دەگێڕمەوە:

بۆ ئازاردانی خەسوم بەپێی توانا زۆر ڕێگام بەکارهێنا، لەمێردمی دوربخەمەوە، بەئازاردانی زۆرم دڵخۆش دەبوو، ئـەو مافانـەی خـودا بەسـەرمانی دا فـەرز کردبـوو، لـەیادم کردبـوو. تۆڵـەی خـودای پەروەردگاری جیهانیان لەمن وەکو پەرچـە کـرداریّ زۆر سـەخت بـوو لەبناغەوە ژیانی وێران کردم.

ئەو کاتە ئەم ئایەتـە قورئانیـەم هاتـەوە یـاد ﴿وَلاَ تَحْـسَبَنَّ اللّـهَ غَـافِلاً عَمَّـا يَعْمَـلُ الظَّـالِمُونَ إِنَّمَـا يُـؤَخِّرُهُمْ لِيَـوْمٍ تَـشْخَصُ فِيـهِ الأَبْصَارُ﴾. ﴿ابراهیم/ ٤٢﴾.

واتە: وامەزانن خودا لەو کارانەی ستەمکاران دەیکەن بیّ ئاگایـە، بـەڵکو بـۆ ڕۆژیّ دوایـی دوای دەخـات، کـە چـاوەکان تـیّ ی دادەحەپەسێن.

فرمێسکەکانم وەکو دەریا دەهاتن، ئەوەی ڕوی دەدا کێشەکی خامۆش بوو، یان بەئاشکرایی بوو، لەنێوان خەسوو بووکدا، لەڕاست مافی هەریەکێ لەو دووانە، خەسوو مافەکانی بەلەپێشتر دادەنا، بووکیش مافەکانی لەپێشتر دادەنا، بەڵام بووك ئەوەی قبوڵ نەبوو، مێردی بەموڵکی تایبەتی خۆی دادەناو بەسەر خۆی دا تاپۆ کردبوو، لەڕاست ئەودا کەسی بەخاوەن ماف نەدەزانی گەر دایکی ئەویش بوایە.

زۆرجار ژن کارتی یاریەکەی بەدەستەوەیەو وادەزانێ هەمیشە ئەو دەیباتەوە، سەری بەسەری دایکییەوە دادەنێت، بەڵام حیساباتەکەی هەر چۆنی بێ جەنگی یەکلایی کراوە بۆ بەرژەوەندی دایك دەبێت، لەبەر ڕەچاو کردن، تاڵی دوژمنکاریەکە هەندێ جار واڵە ژنەکە دەکات بەتەواوی لێی حاڵی نەبێ، بایەکە بەپێ ی حەزی کەشتییەکان هەڵنەکات.

بەسەرهاتی من زیاتر لەخەیاڵەوە نزیکە، ستەم کردنی من لە خەسوو و وروژاندنی هۆی بەدبەختی من بوو، کە پێنامە ناکرێ، لەناکاودا هەموو شتێ هەرەسی هێنا، بۆیە سەرگوزشتەی خۆم دەگێڕمەوە.

ئەو مێردەکەم ئامۆزام بوو، هەر لەمنداڵییەوە هۆگری یەکتری بوو

بووین، هەتا لەکاتێکدا گەورە بووین لە ناوەڕاستی ئاهەنگی خۆشی خێزانی دا بەیەکتری بڕاین، لەژیانەکی ئەوەندە کامەراندا بووین، کە زۆرلە ئەفسانە دەچوو. تا خەڵکی لەڕوی تەبایی خۆشەویستی نمونەیان پێمان دەهێنایەوە. دیسان خودا دوو منداڵی پێ بەخشی بووین، کوڕەکە بەناوی باپیرەی خۆی کرابۆوە، کچەکەش بەناوی دایکی من کرابۆوە. مێردم ئەوەندە خۆشی دەویستم ئێرەیی پێ دەبەم، خۆشم بەڕای هەموویان زۆر جوان بووم و شۆخ بووم، خۆشم زۆرم بایەخ بە خۆدەدا، ئەو جوانی و ئەو خۆشەویستی یەی مێرد بۆمن هانیاندا لەگەڵ خەسووم دا ئەو نەیارییە دروست بکەم.

من بەشێوازەکی سارد دڵنەوازی ڕق هەستانی ئەوم دەکرد، چونکە هەموو سەرە داوێکم گرتبوو، من لەدڵی خۆمدا دەمزانی ئەمە هەڵەیە، بەڵام ئەمە کاری تێم کردبوو، کە گوێ بیستی ڕق لێ بونەوەی خەسووم و بووك دەبووم . بەهەرا وام لەمێرد کرد پەیوەندی لەگەڵ دایکی دا زۆر ساردبێ، چەند ڕۆژێ بەردەوام بووم لە سەر ڕق هەڵساندنی، ئاوا یاریەکە دەوامی کرد، کاتێ مێردم گوێ ڕایەڵی سکاڵای دایکی نەدەبوو، لەڕاست مندا هەست بەزۆرزانیيەك دەكرد لەسەروی ئاستی ژنانی میسرەوە بێ لەڕاست یوسفدا (ع)!!

تا ئەو ڕۆژە ڕەشە هات، کە خەسووم لێدانەکی وای لێدام

هەڵنەستمەوە، هەمووشتەکی لەژیانمدا لە چەند ساتێکدا لێ هەڵتەکاندم، من نازانم ڕاست دەکات، یان ڕاست ناکات ورق هەڵسانی وای لێ کرد، ئەم هەڵوێستە وەربگرێ؟ بەهەرحاڵ من زیان مەندو پەشیمان بوومەوە.

لەو ڕۆژە ڕەشەدا خەسووم نەخۆش کەوت و هاتم سەردانی بکەم، کاتێ لەتەکیدا دانیشتم بەهەموو جۆرێ خۆم ئارایشت دابووم پێم وت: (ڕاسپاردەی دوای مردنت بنوسە). بەڵام ئەو هەڵساوەو بەچاوی پڕ لەفرمێسك وتی: کچم مردن حەقە، ئەنجا بەپەلە گەڕامەوە ماڵی خۆم. وەکو جاران کاتێ مێردم گەڕایەوە بانگی منداڵەکانی کردم و لەگەڵیاندا کەوتە گاڵتە کردن ، باسی یاداشتە خۆشەکانی دەکرد کە بەسەرمان بردووە، وتی: نازانم چۆن بێ تۆ هەڵبکەم، هەموو کەس ئێرەییمان پێ دەبات. وتم: منیش هەروەها.

پێم وت: دایکت نەخۆشە، بەڵام مەچۆ. بەڵام ئەو چوو، چەند خولەکێکی نەبرد بە ڕوپەکی گرژ گەڕایەوە وسەری دانەواند بوو، منیش وتم: مردووە؟ وتی: نەء.

وتی: بەڵام! وتم: بەڵام چی! هەرچی ئەو بوو قسەی نەکردوو چووە دەرەوە.

لەو کاتەدا زانیم دایکی قسەیەکی لا دڕکاندووە بێزاری کردووە،

منیش چووم زۆربەگاڵتەو فیــزو خۆبادانــەوە وتم: هــاپیرەژن چــیت بــە مێردم گوتووە؟

بەساردییەوە بە دەنگەکی پچڕ پچڕ وتی: مــردن حەقــە، مــن بــێ ئاگام لە ڕابردوو، تۆو ئامۆزاکەت شیرتان پێکەوە خواردووە.

گوێم لەمەلایەك بوو لەسەر وێستگە ئیمڕۆ وتی: نابێ بــرای شــیری خوشکی شیری بخوازێت، منیش پرسیارم لــەزانایان کــردووە وتویانــە: هاوسەر گیری کوڕو بووکەکەت بەتاڵە.

منیش بەڕوویدا هاوارم کرد: تۆ ژیانت وێران کردم؟ ئەمە گوناهــە، تۆ کینە لەدڵیت، ئەوکاتە دنیا لەبەر چاومدا سوڕاو کەوتم. کارەساتێ ڕویداوە بووە بەدەنگ و دژی سەرزمانی خەڵکی. لەڕاستی شــیردانەکە لە دایکم پرسی؟ وتی: چەند قومێ بــووە لەقامکــەکانی دەســت تــێ پەڕی نەکردووە. بەڵام ئەو ژنە سوێندی خوارد زۆرلە مەپتر بووە، بــەم شێوەیە دادگا پێی تەڵاقدانو بەدانەوەی منداڵ لێکی جیا کردینەوە، بەمە هەموو شتەکی جوانم لەژیاندا لەدەست چوو، من هانم دا دەست بەگێڕانەوەی شیردانەوە بگرێ، بەمە دڵمی تێك شکاند وەکو چۆن من دڵی ئەوم تێك شکاند بوو، ســزایە لەڕەگــەزی کارەکەیــە. بــەڵێ مــن لەمەدا تاوانبار بووم. هەر لەوساتەوە دەگرییم و ئــەو تاوانــە گــەورەم دێتەوە یاد کە لەڕاست ئەو ژنە بەستەزمانە کردوومە.

**چیرۆکی سی و هەشت:**

# خۆشەویستی تەمەن

## ئەم بابەیە ئەم شێوەیە سەرگوشتەی خۆی دەگێڕێتەوە

من منداڵ بووم، کە باوکم مردو، دایکم مشۆری منی گرتە ئەستۆ، دەچوو خزمەتکاری ماڵانی دەکرد، تابژێوی ژیانی من دەربێنێت، من تاقانەی ئەو بووم، منی نایەبەر خوێندن تاقۆناغی زانکۆم تەواو کرد، من چاکەم لە ڕاستدا دەکرد. هەواڵی چوونە هەندەرانم پێ گەیشت، دایکم بەفرمێسك ماڵ ئاوایی لێ کردم و دەیگوت: کوڕم وریای خۆت بەو هەمیشە بە هەواڵەکانت بەسەرمان بکەوەو لەنامەکانت وامان مەبڕە، تا لەتەندروستیت ئاگادارم.

ئەوە بوو چوومە خۆرئاوا تا خوێندنم لەوێ تەواو بکەم، دوای ماوەیەکی زۆر بۆ وڵاتی خۆم گەڕامەوە، بەڵام وەکو کەسێکی تر گەڕامەوە، بەتەواوی شارستانی خۆرئاوا کاری تێم کردبوو، ئاینم بە دواکەوتوویی و کۆنەپەرستی سەیر دەکردوو، خواپەنامان بدات بەس بڕوام بەژیانی ماددی هەبوو.

کاتێ گەڕانەوەم پیشەیەکی بەرزم بەدەست هێنا، دوای ئەوە

سۆراغی ژنم کردوو، هاوردم، دایکم ئافرەتێکی دینداری دوایێن پاکی بۆ دەست نیشان کردم، بەڵام من سووربووم لەسەر هێنانی ژنەکی جوانی دەوڵەمەند، من خەونم بەژیانی ناسراو بە (ئەرستۆکراتی) یەوە دەبینی.

دوای ئەوەی ژنم هاورد، دوای (٦) مانگ ژنەکەم پلانی بۆ دایکم دەکێشا تاوام لێی هات لەبەر دڵی خستم. ڕۆژێکیان چوومە ماڵەوە ژنم دەگریا، منیش لێم پرسی بۆچی دەگریت؟ وتی: سەیرکە یان من یان دەبێ دایکت لەو ماڵەدابن و لە مەزیاتر ئارامم نەماوە.

منیش شێت بووم و دایکم لەوساتە تووڕەییەدا بەدەرنا، شەیتانی ڕەجم کراو هزری داگرتم، دایکم ڕۆیشت و دەگریاو نزای دەکرد: کوڕم خوا چاکت بکات، خوا بەختیارت بکات.

دوای چەند کات ژمێرێ چووم سۆراغی بکەم، بەڵام نەم دۆزییەوە، هەرچی ژنەکەم بوو توانی بەفێڵی خۆی ئەو دایکە چاکەیەم لەبیربباتەوە.

کە هەموو تەمەنی خۆی لەپەروەردەی مندا خەرج کردو، شەونخونی بۆ کێشام و، ئەو برسی بوو منی تێرکردو خۆی ڕوت بوو منی جل و بەرگ کرد.

ماوەیەك هەواڵی دایکم نەما، لەو ماوەیەدا دووچاری

نەخۆشییەکی پیس هاتم و لەنەخۆشخانەدا کەوتم.

کاتێ دایکم هەواڵ دەزانێ دەگریێ و دێتە سەردانم لەنەخۆشخانەدا، بەڵام ژنەکەم، لەلام بوو بەرلەوەی بێتەلام دەری دەکات و پێ ی دەڵێ: کوڕەکەت لێرە نییە، بۆیە بەڕێگای خۆیدا دەگەڕێتەوە.

لەنەخۆشخانە چوومە دەرەوە، پاش ماوەیەکی زۆر باری دەرونیم زۆر خراپ بوو، پیشەو ماڵم لەدەست داو قەرزی زۆرم کەوتەسەر، ئەمەش بەهۆی ژنی خراپمەوە، کە داواکاری قورسی دەخستمە سەر ماندوی دەرکردم.

لەکۆتایی دا ژنە جوانەکەم پێی وتم: مادام پیشەو داراییت لەدەست بۆوە. لە کۆمەڵگادا پایەت نەماوە بەڕاست و ڕەوانی من تۆم ناوێ و تەڵاقم بدە.

ئەو هەواڵە وەکو تریشقەیێ بوو بەسەرمەوەو لەژێرباری فشار زۆری لێ کردنی دا، خۆی بەمن تەڵاق دا: تا دوای ئەوە لەو خەوی بێ ئاگاییە بێداربمەوە. هەڵسام سۆراغی دایکم بکەم و بە دەنگی بەرز هاوارم دەکرد: دایە تۆلە کوێ ی... من ستەمم لێ کردی، لەراست چاکەکانتدا سپلە بووم.

لەکۆتایی دا دۆزیمەوە، بەڵام لەکوێ؟ بینیم لەیەکێ لەقوژبنەکانەوە



خەڵکی خێری پێ دەکەن. کە چـوومە لای شـوێنەواری گریـانی پێـوە دیار بوو کاری تێ کردبوو ڕوی کاڵ وزەرد بوو بوو. هەر کە چاوم پـێ کەوت بەگریان خۆم بەسەر قاچەکانیدا داداو ئەویش هاوبەشی گریـانی کردم.

کاتژمێرێ ئاوا ماینەوە، پاشان فرمێـسکم سـڕیەوەو بـۆ ماڵـەوەم بردەوەو سوێندم خوارد، کە هەمیشە گوێ ڕایـەڵی بم، بەرلـەوە گـوێ ڕایەڵی خواو حەلاڵ و حەڕامی ئەوبم. من تائێستا ژیانـەکی کامـەران لەگەڵ خۆشەویستی تەمەنم دا بەسەر دەبەم، کە دایکمە.

**چیرۆکی سی و نۆ:**

# هیندو دایەنێك

ئەم بەسەرهاتە تان پێشکەش دەکەین، کە فرمێسك بەچاوەکاندا دێنێتە خوار، چونکە کەمتەرخەمی و دزێوی لەلایەکی ترەوە تێدایە.

باوك پێویستە هەموو بەیانیان بڕواتە سەرکار، لەسێی ئێوارەدا بەتەواوی شەکەت دەبوو لەپەلوپۆ دەکەوت. کە ڕۆژ بەسەر دەچوو کە ئەو هەموو ئارەقەیەی ڕشتووەو، ڕەنجێکی زۆری داوە، هەمووشی بۆ ئەوەی پارێکی ژیان بۆ خێزانە بچووکەکەی دابین بکات دایکیش بەڕۆڵی خۆی، دوای چەند کاتژمێرێکی کەم، پاش دەرچوونی مێردەکەی دەچووە سەرکاری خۆی.

بەوپێ و دانانەی هاوکێشە ژیانی لەسەریان پێویست بوو کە دایەنێکی بیانی هەبێ منداڵەکەی سەرپەرشت بکات، کەهێشتا پێنج ساڵانەی نەبڕیوە.

کچەکە منداڵەکی خنجیلانەو جوان بوو، زیرەکی لەچاوەشینەکانیەوە وەکو بریسکە دەبریسکایەوە، کە ئاوێتەی بێ تاوانی ئەو منداڵە شیرینە بوو.

ئەوە بوو باوك دايەنێكی هێنا، تا لەو چەند كات ژمێرەی ڕۆژدا مشوريان بخوات تا ئەوان دەگەڕێنەوە، وە تا ئەوكاتەی يەكێ لەوانە زووتر لەسەركار دەگەڕێتەوە.

هەريەكە لەو باوانە پێش بڕكێی زووگەڕانەوەيان دەكرد، تا هەريەكەيان زوتر لەويتريان شەرەفی لەباوەش كردنی منداڵەكەی پێ ببڕێت.

لەوماوەيەدا دايەنەكە بەكارو ئەركەكانی ئەو ماڵە هەڵدەستا، ڕۆژێكيان ئەو دايەنە هەڵەيەكی گەورە دەكات، كە شايانی ئەوە دەبێ دايكی هيند لێ ی تووڕەببێ، دايكی هيند ئەم مەسەلەيە لەياد دەكات، بەڵام دايەنە لەيادی ناكات و كارەكی شەيتانی لێ لەدڵی خۆی دەگرێت.

كە بەيانی داهات ويستی زللەكە بكات بەدوو زللە و بۆ ئەمەش پلانەكی شەيتانی تايبەتی بەخۆی داڕشت. هەڵسا پارچە گۆشتێكی لە يەخچاڵ (بەفرگرە) دەرهێناو لەشوێنێكی ژووری چێشتخانەكەدا شارديیەوە تا بۆگەن بوو كرماوی بوو، كاتێ باوان چوونەدەر لەماڵ ئەو منداڵە بێ گوناهەی هەڵگرت، يەكێ لەكرمەكانی دەرهێنا خستی يە ناويەكێ لەكونە لوتە بچوكەكانی و كرمەكی تريشی خستە ناو كونە لوتی تريەوە. هەموو ڕۆژێ ئەمەی دوبارە دەكردەوە. دايك

هەستی کرد منداڵەکەی تەواونییەو سستەو حەز بەیاری و خەندەی جاران ناکات و بەڵکو هەر خەو دەیباتەوە.

(هەرکە بێدار بۆوە دەڕواتەوە باری پێشووی)، دایك وای زانی کچەکەی ڕۆژانە لەگەڵ دایەنەکەی دا لەگەمەو یاریەکاندا ماندو دەبێ، بەڵام سستی و بێ تاقەتی لەوە دانەبوو، ڕۆژێکیان گوێ ی لەمنداڵە بچوکەکەی بوو لە دایەنەکەی دەپاڕایەوە سبەی تەنیایەك دانەی بخاتە ناو لوتمەوە و لەلوتەکەی ترمی دا مەنێ ، دایکەکە لەمەبەستی هیندی کچی تێ نەگەیشت چی وت؟

دەبێ ئەو دایەنە چی بخاتە کوونە لوتیەوە؟

دایك بڕیاری دا ئەو مەسەلەیە بزانێ کە لەکاتی لەماڵ نەبوونی ئەودا ڕودەدات، دڵە ڕاوکێ دڵی داگرت و گومان داپیۆشی، بەرە بەیانی سبەی دایك خۆی وانیشاندا، کەلە ماڵ چۆتەدەر، بەڵام دوایی بە دزییەکی تەواوە هاتەوە و لەسەر قامکەکان دەڕۆیشت، تا گوێی لەتەپەی پێیەکانی نەبێ، جوان بۆی وەستاو گوێکانی بەتەواوی هەڵخستن... لەوکاتەدا گوێی لەدەنگی هیند بوو لەچێشتخانە لەخزمەتکارەکەی دەپاڕێتەوە کرم نەخاتە ناو لوتیەوەو، بە پاڕانەوەیەکی تەواو هاواری کرد ئەوە ئازارم دەدات. بەڵام کارەکەرە دڵڕەقەکە گوێی، بەسکاڵا بێ تاوانەکانی نەداو لەژووری دا داینا و

ویستی کرم بخاتەوە ناو لوتی وەکو ڕۆژان، لەوکاتەدا دایکەکەی وەکو بروسکە بەهاوارو ڕۆ ڕۆ هەڵی کوتایە سەر دایەنەکە تا منداڵەکەی لەبەر دەستانی بفڕێنێ، ئەنجا پێ ی وت: ئەومنداڵە چی لێ کردویت، خۆهیچ لەژیان تێ ناگات؟

ئایا هیچ ستەمێکی لەبارە کردووی تا ئەو کارەی لەدژدا بکەیت؟

بەهەرحاڵ ئێستا کاتی لێ پرسینەوە نییە، چونکە هیند داهێزراوەو ڕوی زەرد بووەو بەحاڵ نوزەی دێ، دایك لەوکاتەدا وەکو شێتان دەرچوو منداڵە جگەر گۆشەکەی تاودایە بە ئۆتۆمبێل بەخێرایی گەیاندییە نەخۆشخانەو داخ و کەسەری و پەشیمانی دڵی ڕادەپازنی و دەیگوشی. بەخێرایی بەتیشك (الأشیعة) وێنەی مێشکی گیرا، کاتێ نوژدار وێنەی تیشکەکەی دایە بەڕووناکی، ئەوەی بینی واقی وڕماندو ترساندنی، بینی کرم بەمێشکی هینددا دەڕوات. ئەوکاتە پزیشك بە دایکەکەی وت کەکولمی بەفرمێسك تەڕکردبوویوو: بێ سودە!

ئێستا هیند لەگیانەلا دایە. دایك گەڕایەوە ماڵەوەو هیندی لەباوەشدا بوو، تالە ماڵەوە گیان بسپێرێ، دوای یەك ڕۆژ تەواو بوو. ئای لەو کارە دزێوەو ئای لەو کەمتەرخەمی یە. ڕاستە خزمەتکارەکە بەسزای خۆی گەیەنرا، بەلام هیند بۆ باوەشی باوانی ناگەڕێتەوە.



**چیرۆکی چل:**

# ئەحمەد

دایکەکەی ناوی (ام احمد)ە و خانمێکە لەگەڵ شوفێرێکدا بەئەزموونەکی تاڵدا ڕەت دەبێ ، کە هەستی مرۆیی مردووە، ئەو شوفێرە زۆر بەسادەیی کچە بچوکەکەی تیرۆر دەکات و دەبێ بەهۆی کوشتنی. ئەحمەد چوار ساڵانەیەو هەموو بەیانییەك لەگەڵ ئەودا دەڕواتە قوتابخانەی تایبەتی ئەو، ئەو شوفێرە ئەو هەلەیە دەقۆزێتەوەو چەند جارێ دەست درێژی دەکاتە سەر، جارێکیان ئەحمەد لەقوتابخانەکەیدا دەبورێتەوە، دوای بردنی بۆ نەخۆشخانە پاش یەك هەفتە گیان دەسپێرێت. هۆیەکەشی ئەوە بوو شوفێرەکە چەند جارێ دەست درێژی سێکسی دەکاتە سەری. ڕاستە شوفێرەکە بەسزای خۆی گەیشت، بەڵام ئەحمەد ناگەڕێتەوە باوەشی باوانەکەی.

## چیرۆکی چل و یەك:

# هــەیفـــــا

هەیفا بچووك بــووە، بــەڵام ئێــستاکە گەنجــەکی (٢٠) ســاڵانەیە، کەچــی هــیچ دڵــی شــادمان نییــەو دڵــی بەقەدســەری دەرزی کــونی تێدانییــەو، ڕۆژانــی منــداڵی لەچــاوەکانی دا دەرناکــەوێ، (کــچە قوڵەغێکی کوژاوەیە لەئایندەو داهــاتووی نییــە). لــە (٦) ســاڵی دا لەگــەڵ شــوفێرەك و خزمــەتکارێك و باوکــەکی ســەرقاڵ ودایکــەکی کەمتەرخەمدا ژیاوە. کاتێ شوفێرەکە دەبینێ لەگەڵ خزمەتکارەکــەدا لــەبارێکی ناشــیریندانە هــەردوکیان بڕیاریانــدا تۆڵــە لــەو کــچەیە وەربگــرن، ئەوکــچە شــەش ســاڵانە دەبــەن. لــەزوردا بەیارمــەتی خزمەتکارەکــە شــوفێرەکە هەڵدەکوتێتــە ســەر کــچەکەو لەچــەند خولەکێکدا لەکچی دەکات، ئینجا هەردووکیان ڕادەکەن.

چیرۆکی چل و دوو:

## موحەممەد

ئیشەکان بەردەوام دەبن، سێ ڕۆژی ڕەبەق ئەو منداڵە (موحەممەد) لە کەلاوەیەکی کۆندا بێ نان و ئاو ژیان دەباتەسەر، لەنێوان مەرگ و ژیاندا دەبێ، دوای ئەوەی شوفێرەکە لەگەڵ هاوڕێیەکی دا ڕایدەکێشێت، موحەممەد منداڵەکی مەلەوان بوو، لەگەڵ شوفێرەکەیدا دەچووە یانەی وەرزشی و، تەندروستی یەکی ساغ و باشی هەبوو، گورج و چالاك بوو، ڕۆژێکیان شوفێرەکە تکای لێ کرد لەگەڵیدا بڕواتەلای برادەرێکی نەخۆشی و سەردانی بکەن و دوای پێنج خولەك دەگەڕێنەوە ماڵەوە.

موحەممەد لەگەڵیدا باش بوو وتی: باشە بەسەرچاو.

چووە ماڵەکەو موحەممەد لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا چاوەڕێ ی دەکرد.

چەند خولەکێ بەسەرچوو شوفێرەکە هاواری کردو بە موحەممەدی وت: ئەو هاوڕێیەی بوراوەتەوە وەرە یارمەتیم بدە بیبەینە نەخۆشخانە، موحەممەدبڕوای کرد، بەڵام بەداخەوە تا سێ ڕۆژان لەوێدا نەهاتە دەرەوە، لەو ماوەیەدا لەجەستەو دەروندا ڕوخێنرا، چونکە شوفێرەو برادەرەکەی دەست درێژی دەکەنە سەرو زۆربە گەوجی بەجێیان هێشت.(ئایا کەسێك هەیە پەندی لێ وەربگرێت).

**چیرۆکی چل و سێ:**

# نـــــورا

هەر چەندە دایکی سور دەبێ کە لەو تەمەنەدا، کە شەش ساڵانەیە لەگەڵ شوفێرەکەیدا بەتەنیا بڕواتە قوتابخانـەو بێتـەوە، بـەڵام نیـازی ناپاکی شاراوە بەزەیی بە نوڕای چکۆلەدا نەهاتەوە، کە بەسەختترین و تاڵترین ئەزمونی تەواوی ژیانی دا گوزەر بکات.

ڕۆژێکیـان دایکەکـەی نـەخۆش دەکـەوێ و دوای ناچـار کـردن منداڵەکە ڕێگا پێدەدات لەگـەڵ شـوفێرەکەدا بڕواتـە قوتابخانـە، تـا داهاتووی لەدەست نەدات، لێرەدا شوفێرەکە کە نەناسراوە ئەم هەڵەیە دەقۆزێتەوە،.

کاتێ دەرفەت هات لەدەستی نادات و، کچەکە دەباتـە شـوێنەکی دورو چۆڵ تا بە شێوازێکی دڕندانە کارەکەی بکـات، پاشـان دەیباتـە شوێنەکی نزیك لـە قوتابخانـەو لـەوێ بـەجێ ی دێڵـێ و بـۆ خۆشـی ڕادەکات.

پاشان بەڕێوەبەری قوتابخانە پەیوەندی بەدایکییەوە دەکات بەپەلـە بگاتە قوتابخانە. کاتێ دایك دەچێ دەبینێ کچی لـەخوێن گـەوزاوە و لەلایەن شوفێرەکەوە دەست درێژی سێکسی کراوەتە سەرو فڕێنراوە.

چیرۆکی چل وچوار:

# هــەتـــــان

سەرەتای داستانەکە ئاوایە، باوك هەندێ هەڵس و کەوتی نامۆی لە منداڵەکەی دا دەبینێ، کاتێ لەگەڵ دایکی هەتاندا دەریان دەخات، بینی منداڵەکەی، کەسێ ساڵانەیە زۆر هۆگرو مرودەی دایکییەتی وجوڵەی سەیر لەگەڵ دایکی دا دەکات. هەرچەند سەرەتا گاڵتە و پێکەنینیان بە بارودۆخەکە دەهات. بەڵام دوایی گومانی خستە دڵی باوکەکەوە، بۆیە چاودێری بە پەنهانی خستەسەر منداڵەکە، پاشان بەسەر ئەو ڕوداوەدا گەیشتەجێ، کە خزمەتکارەکە ئەو منداڵە سێ ساڵەیەی قۆرغ کردووە بۆ کاری سێکسی لەگەڵ خۆیداو بەزەیی بەو تەمەنە زویەی دانە هاتوەتەوە، هەڵساوە منداڵەکەی فێری پەیوەندی سێکسی ناڕەوا کردووە (خودا پەنامان بدات).



**چیرۆکی چل و پێنج:**

# وەلیـــــد

ئەمەش خزمەتکارەکی ترە دەتوانێ منداڵەکی وەکـو وەلیـد، کـە (١٥) ساڵی دەباتـە ژێربـاری هـەواو ئارەزووەکـانی بکـات و بیکاتـە کۆیلـەی هەوەسـەکانی خـۆی و خۆشـی بکاتـە کۆیلـەی هـەواو ئارەزووەکانی . وەلید لەڕوی کۆمەڵایەتییەوە سەرکەوتوو بوو، ژیان و خەڵکی خۆشیان دەویست، بـەڵام هەرکـە خزمەتکارەکـە هاتـە نـاو ماڵیانەوە، تا بۆ چوونە دەرەوە، بۆ بۆنەو یادەکانیش لەگەڵ خێزانیـدا ڕازی نـەبوو، لەقوتابخانەشـدا هـەر بـەرەودواوە دەگەڕایـەوە، بـاوان نەیاندەزانی چی ڕویداوە، تەنیا ڕێکـەوت بـاوکی بەسـەر بارودۆخـەدا ڕاگەیاند ولەڕاستی یەکەی حاڵی کرد، لەگەڵ دایکـدا بـۆ بـۆ نەیـەك چوونە دەرەوە، وەکو جاران وەلید نەچوو لەگەڵیاندا بەو پاساوەی ئـەو دەوران دەکاتەوە، لەپڕا باوك شتەکی لەماڵـەوە لـەیاد کردبـوو بـۆی گەڕایـەوە، لەماڵەوەیانـدا حەقیقەتـە شـاراوەکەی بینـی، کوڕەکـەو خزمەتکارەکەی بەرچاو کەوتن، شەیتانیش سێ یەمیان بوو. ئەو ڕۆژە باوکەکە وەلیدی دایەبەر لێدان و خزمەتکارەکەش چووە شارو وڵاتـی خۆی. بەڵام ئایا کێشەکە بڕایەوە؟



**چیرۆکی چل و شەش:**

## سارەو سەماهەر

دایك تێبینی کرد کچۆڵە جمکەکانی هەرکە بانگی خزمەتکارە دەکات، ئەوان هەڵدەلەرزن، چونکە هێشتا (٤) ساڵانە بوون، زۆر ئاورِی لە مەسەلەکە نەدایەوە، بەڵام جارێکیان لەهاواری یەکێکیان بێدار بۆوە، لەژوری خزمەتکارەکەیدا، بینی یەکێ لەوکچانە رِوت کراوەتەوە ناچاری دەکات بۆ خراپە کردن و ئەوەکەی تریشی چاوەرِێ یە. ئای لەم بەڵایە!

**چیرۆکی چل و حەوت:**

## عـــەبیـــــر

دایکەکی تر لەگـەڵ عــەبیر دەدوێ و گەمــەی لەگەڵــدا دەکـات و قسەکان وەکو دەڵێن دڵگیر بوون، لەپڕا کـچەکە لـەخۆوە، کـە پێـنج ساڵانە دەبـێ بـاس لەشـتی بـێ ئـابڕویی دەکـات، کـە لەگـەڵ خزمەتکارەکەیـدا ئـەنجامی داوە، داوا لــەدایکی دەکـات ئـەویش وابکات، دایکەکەش لەو قسانە سەری سـوڕ دەمێنـێ و دەحەپەسـێ، بۆیە خزمەتکارەکە دەردەکـات و خـۆی بـە پـەروەردەی منداڵەکـەی هەڵدەستێت.

**چیرۆکی چل و هەشت:**

# جادو لێ کراوێك

شێخ (وحید البالي) دەڵێ: نەخۆشێك هاتەلام دوای نوشتە کردن زانیم جادویەکی گەورەی لێ کراوە، لەخەون و بێداری دا تارمایی وشەبەحی بۆ دەنێردرێت. چەند کاسێتەکم دایە دەنگی قورئان بوون، داوام لێ کرد بەردەوام گوێیان لێ بگرێ، جادووەکە بەتاڵ دەکاتەوە (انشاء الله).

کەس وکاری کچەکە وتیان: هیچ ڕێگایەك هەیە شوێنی جادووەکەی بدۆزینەوە؟

وتم: بەڵێ. وتیان چییە؟ وتم: پاڕانەوە لەسێ یەکی دوایی شەوداو لە کاتی کورنۆشدا. ئەوە نەخۆشە بە پاڕانەوەو کورنۆش ولالانەوە هەڵدەستێ، وەکو بۆیان گێڕامەوە شەوێ خەون دەبینێ کەسێك دێ دەستی دەگرێ دەیباتە سەر ئەو شوێنەی ماڵەوەیان کە نوشتەی جادوی تێدا حەشاردراوە.

بەیانی نەخۆشەکە خەونەکە بۆ خزمانی باس دەکات و ئەوانیش دەچنە ئەو شوێنەو سیحرەکە دەدۆزنەوەو بەتاڵی دەکەنەوەو کچەکە

چاك دەبێتەوە (سوپاس بۆ خودا).( ئەم جۆرە پاڕانەوە پێـی دەوتـرێ نوێژی (الاستخارە) کە بەر لەخـەوتن دوو رکەعـەت دەکـرێ، شـایەد ئەوەی مەبەستە ئایا دەبێ یان نابێ، ئایائەو شتە لەکوێیە؟ بەخەونی خوایی ببینیت (جابر) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم نوێژەی وەکو ئایەتێکی قورئان فێری ئێمە دەکرد) (بوخاری گێڕایەوە /ئامادەکار)

**چیرۆکی چل و نۆ:**

# تورە بوون

(سولەیمان بن صرد) دەگێڕێتەوە: لەگەڵ پێغەمبەردا -دخ- دانیشتبووم دوو پیاو جنێویان بەیەکتری دەدا، یەکێکیان سور هەڵدەگەڕێ و دەماری جووت دەبن و دەردەپەڕن، پێغەمبەر -دخ- فەرمووی: من یەك ڕستە دەزانم، گەر بیڵێ ئەوەی توشی بووە لێ ی دەڕەوێتەوە گەر بڵێ: (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) هیچی لەبەر دڵ نامێنێت.

هاوەڵەکان پێیان وت: پێغەمبەر -دخ- فەرمووی با (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بکات. (بوخاری گێڕاویەوە).



**چیرۆکی پەنجا:**

(احمد) لە (مسند) داگێڕایەوە: عەلی (س) گێڕایەوە پێغەمبەر – دخ- لەعەرەفە وەستا، ئافرەتێکی گەنج لە (خثعم) هاتەلای، وتی: باوکم پیرە مێردەکی خەڵەفاوەو حەجی خوای کەوتۆتە سەر ئایا حەجی لەبریتی بکەم دروستە؟

فەرمووی (ص) بەڵێ: بیکە بۆ باوکت. ئەنجا ملی (فضل)ی وەرچەرخاند، عەبباس (ر) وتی: بۆچی ڕووی ئامۆزاکەت سوڕاند؟ فەرمووی: بینیم کچ و کوڕەکی گەنجن، ترسام شەیتان زەفەریان پێ ببات.

## (كۆتــايى)

ئەم بەسەرهاتانەى خوێندتەوە بەشێك لــە پلانــەكانى شــەيانت بــۆ دەردەخات، كە هــەوڵ دەدات مرۆڤــى موســڵمان لــە ئــاين ورەوشــتە جوانەكەى دوربخاتەوەو، بانگى دەكات بۆ خراپــەكارى و بــىٚ دينــى و بەدڕەوشتى يەكان، تا لەداهاتوودا ببێتە ياوەرى ئەو لە دۆزەخدا.

شەيتان بىٚ پێچ وپەنا دواى نەفرين لىٚ كرانى مەرجى كردو بەخواى وت: ﴿وَلأُغْــوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِــينَ إِلا عِبَــادَكَ مِــنْهُمُ الْمُخْلَــصِينَ ﴾. ﴿الحجر/٣٩- ٤٠﴾. بۆيە خوا مرۆڤى لەو دوژمنە سەر ســەختە وريــا كردۆتەوە: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَــهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾. ﴿الفاطر/٦﴾.

بۆيە نەكەى هاوڕىٚ ى بــاوەڕدارم برۆيــە نــاو جــوغزى شــەيتانەوەو بكەويە ژێركاريگەرى تێفرۆسماندنەكانى ئەوو وەسوەسەكانى، لەرێگاى ڕاستت لابدات و دنياو رۆژى دوايى لەدەست بدات.

با ئەم دەستە بەسەرهاتە پەندێك بن بۆ خۆپاراســتنت لەپلانــەكانى شەيتان، خواى گەورە ئێمەو ئێوەش پەنابدات.

**تێبينى:** ئەم بەسەرهاتە واقيعى و پڕ لەپەندانە لە كتێبى (ضحايا الشيطان / يوسف الحاج) وەرگيراوە.

**چيوەى سەرو ٢٠/ ٩/ ٢٠٠٨**

# ناوەرۆك